چاپی یەکەم
2019

# لەم سێ کەسە ببورن

## چەند یاداشتێکی تر
## بۆ گۆڕانکاری لە ژیاندا



د. مەحمود موعەزەمی

وەرگێڕانی: سەربەست مستەفا

**له بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

زنجیرە ٧٩٠






ناسنامەی کتێب

## با لەم سێ کەسە ببورین

- نووسینی: دکتۆر مەحمود موعەزەمی
- وەرگێڕانی: سەریەست مستەفا
- بابەت: دەروونزانی. سەرکەوتن.
- بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٩
- شوێنی چاپ: چاپخانەی کەنج
- تیراژ: ١٠٠٠

**له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١٠٧٣)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.**

**ناونیشان**

سلێمانی ـــ سابوونکەران ـــ نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکیە رووتە.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست


کتێبخانە
پێگەیەک بۆ خزمەتگردنی خوێنەران و نووسەران

# پێشەکی

**طبیب عشق مسیحا دم است و مشفق لیک**
**چــو درد در تــو نبینـد کـه را دوا کند***

خوێنەری بەڕێزی ئەم کتێبە، بەبێ ئەوەی کە لە نزیکەوە ئێوە بناسم، بەڕێژەیەکی سەدی بەرزەوە دەتوانم لەبارەی ئێوەوە پێشبینی چەند شتێك بکەم. یەکەمیان ئەوەی کە ماوەیەکە پرسیارێك یان چەند پرسیارێکی بێ وەڵامتان لە خۆتان هەیە، نازانم ئەو پرسیارانە چین؟ بەڵام دەتوانم بە ئێوە بڵێم وەڵامی پرسیارەکانتان لەناوجەرگەی نوسینەکانی ئەم کتێبەدا دەدۆزنەوە. کەوابوو ئێستە کە پرسیارتان هەیە و لەوەش گرنگتر بەشوێن وەڵامەکانیاندا دەگەڕێن، هەڵی پێویست بدۆزنەوە و بەبێ وەستان بابەتەکانی بەوردییەوە بخوێننەوە و هەرکاتێك شتێك هات بە بیرو زەینتاندا یاداشت و تۆماری بکەن.

---

* ڕێنماکاری عەشق نەفەسی مەسیح ئاسایە لە زیندووکردنەوەی دڵە مردووەکاندا بەڵام ئەگەر دەردونازاری داواکاری لە تۆدا نەبینێت چارەسەر و دەرمانی کێ بکات؟!

ئەم کتێبەی کە لەبەردەستتاندایە، بەرهەمی جێبەجێکردنی بابەتی کۆمەڵێك بەرنامەی تەلەفیزیۆنی تۆمارکراوە بەناوی (دەبێت چاوەکان بشۆین).

دووەم خاڵ کە لەبارەی کەسایەتی ئێوەوە دەبێت بیڵێم، ئەمەیە کە ئێوە هەستی ئەرکێکتان لە خۆتاندا دۆزیوەتەوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەچنە ژێرباری ژیانێکی ئاسایی وماندوکەرەوە. هەربۆیە بەردەوام لە گەڕان و پشکنیندان بۆ ئەوەی ئەرکی خۆتان لە ژیاندا بدۆزنەوە.

سێیەمین خاڵیش بریتیە لەوەی کە حەزی فێربون و زانین لە ئێوەدا زۆر لە ئاستی مامناوەندی ئەو کۆمەڵگەیە زیاترە کە تێیدا دەژین. هەر ئەمەیە کە ئێوە کەمێك بێقەرار و هەندێکجاریش بێتاقەت و ڕەشبین دەکات. بەڵام بزانن کە گرنگتر لەوەی کە وەڵامی پرسیارەکانتان بدۆزنەوە، فێری ژیانێکی بەختەوەر بوون و لەگەڵیدا دەژین. گرنگتر لە وەڵام بریتیە لەوەی کە مرۆڤ لە ژیاندا پرسیاری هەبێت. پرسیارێك کە مرۆڤ بێقەرار دەکات و لە ئەدەبیاتی گەورەی (پارسی)-فارسی-دا پێی دەڵێن (دەرد و ئازار) کە جیاوازە لە ڕەنج و تاڵی. هەر لەم ڕووەوەیە کە پێشینانی دیارو بەرچاوی ئێران باوەڕییان وابووە کە دڵێك ئازاری تێدا نەبێت دڵ نییە.

خاڵی چوارەم ئەوەی کە ئێوە لە داهاتوی ڕووناکی ئەم سەرزەمینە و ئاوەدانیەکەیدا بەش و پشکتان دەبێت، چونکە

ماوەیەکی زۆرە کە خاوەنی ئەو بەش و پشکەن و لەوانەیە ئاگاداری ڕۆڵی بەنرخ و پڕبایەخی خۆتان نەبوبنەوە.

پێنجەم خاڵی پێشبینی من ئەمەیە کە خوداوەندی هەستی، ڕۆژگار، جیهانی هەستی و ئێوە هەر ناوێکی لێدەنێن. ئاگادارییەکی تایبەتی لە ئێوە هەیە. ئەم ئاگادارییە گشتی و هەموانییە، بەڵام لەمبارەیەوە لەسەر ئەو باوەڕەم کە لە ئێوەدا ئەم توانایییە شاراوەتەوە بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای ئەو ببنە سەرچاوەی خزمەتگوزاریگەلێکی بەنرخ بۆ ئەم جیهانە. جیلوە زانستیەکەی، سەرەتا لە ئاوەدانی خۆتانەوە دەستپێدەکات و باشترین کاتی ئەنجامدانیشی، هەر ئێستەیە. کەوابوو ئەگەر باوەڕتان بە دەسەلاتدارێکی گەورەتر لە هەر هێزێکیتر هەیە کە من ناوم لێناوە (ئافەریدگار یان خوداوەند)، لەبەر ڕێزی ئیرادەی ئەو ئافەرێنەرە باوەڕ بە خۆت بکە و ئەو ئەرك و لێپرسراوییەتیەی کە خستویەتیە سەرشانتان بەوپەڕی ئەدەب و ڕێز و لە خۆبوردوییەوە قبوڵی بکەن و هەر لە ئێستەوە هەوڵبدەن تاوەکو (دونیا بکەنە شوێنێکی زۆر باشتر بۆ ژیان).

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کتێبە ئەمەیە کە پێکهاتەکەی لە کۆمەڵێك چەمك و مانای بەکارهێنانی لە ژیانی ڕۆژانەدا دروستبوە و بە زمانێکی پاراو پێکهاتون، کە هەر یەکەیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ ماناکان دەگوازنەوە. لەم ڕوەوە ئێوە دەتوانن لە هەرشوێنێکی کتێبەکەوە کە ویستتان دەستبکەن بە خوێندنەوە و

ماناکانی له ژیانی ڕۆژانەتاندا بەکار بهێنن و دۆزینەوە و پێشکەوتنەکانتان بۆ ئەو کەسانە باسبکەن کە خوازیارن و حەز دەکەن. ئەگەر دەتوانن بابەتەکانی ئەم کتێبە فێری ئەو کەسانە بکەن کە حەزیان لێیەتی. چونکە بەمکارە لەگەڵ ئەوەی کە خزمەتتان بە گەشە و بەرزبونەوەی ئەو کۆمەڵگەیە کردووە کە تێیدا دەژین، ماناو چەمکەکانی کتێبەکەش بۆ خۆتان باشتر و زیاتر ڕووندەبنەوە و جێگە دەگرن.

لە کۆتاییدا بە سوپاس لە خودای گەورە و میهرەبان، ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم بە بابە گەورە و دایەگەورەکانم بەتایبەت جەنابی کاک (محمدی موعەزەمی)، کە بەشێوازی گێڕانەوەی چیرۆك و گێڕانەوەی داستانە پەند ئامێزەکان و پێشەنگبونی جەنابیان، تۆوی میهرەبانی، لەخۆبوردویی و هەستکردن بە لێپرسراوییەتی لەناو نەوەکانی خۆیدا، لەوانەش لەناخی نوسەری ئەم کتێبەدا چاند.

لێرەدا جێگەی خۆیەتی بەم هۆیەوە زور سوپاسی یارمەتیەکانی هاوکارانم بکەم، بەتایبەت جەنابی کاك عەلی قەزوینی ئەندازیار و پیاوی قەڵەم و جەنابی کاك حوسەین یاخچی و هاوکارەکەیان لە نوسینگەی گۆڤاری بەنرخ و کاریگەری (خلاقیت). بەڕاستی ئەگەر عەشق و زانست و هەستکردنی ئەم ئازیزانە بە لێپرسراوییەتی نەبوایە، بەدورم دەزانی کە ئەم کتێبە بەم سادە و ئاسانیە بگات بەدەستی عەودالان و خوازیارانی.

بەوپەڕی خاکەساری و خۆشکێنیەوە سوپاسی هەر هەمویان دەکەم. ئەو کەسانەی کە بەبێ ئەوەی بیاننناسم، بەبێ ئەوەی کە چاویان لە باربۆ و قەرەبو بێت، یارمەتیان دام، دڵنیابن و بزانن کە لەلای خودای جیهان و هەستی، نرخ و بەهای ئەوکارەیان بە مسقاڵە زەڕە و تۆسقاڵ لەبەرچاوگیراوە.

شاد و تەندروست بن

به سوپاس و ڕێز و عەشقەوە

***مەحمودی موعەزەمی***

**پەراوێزی یەکەم:** ئەگەر خوێندنەوەی ئەم کتێبەتان بە سودبەخش زانی، بە ئەرك نەبێت پێشنیاری خوێندنەوەی بۆ ئازیزانیترتان بکەن. سوپاستان دەکەم.

**پەراوێزی دووەم:** ئەگەر بە باشی دەزانن کە نەك تەنها ئەم کتێبە، بەڵکو هەموو ئەو کتێبانەی کە بەلاتانەوە پەسەندن، بیانکڕن و بەدیاری بیانبەخشن بەو کەسانەی کە خۆشتان دەوێن یاخود پێویستیان پێیانە. بەمکارە سادە، بەڵام بەنرخە، دەتوانن ڕۆشنبیری کتێب خوێندنەوە لەناو کۆمەڵگەدا دامەزراوو جێگیر بکەن.

# چ کەسێک بێتوانایە؟

بە بۆنەی ئەو کارەی کە هەڵمبژاردووە، زۆریك لە ژنان و پیاوان بەتایبەت کوڕ و کچە گەنجەکان سەردانم دەکەن، بەڵام یەکێك لە بابەتە گرنگ و جێگەی داخەکان ئەمەیە کە دەڵێن من بێتوانام. چی بکەم؟ من گەمژە و خاوو خلیچکم، چی بکەم بۆ ئەوەی هەست و هۆشم هەبێت؟ بەڕاستی ئێوە چۆن بیر دەکەنەوە؟ باشە ئەم کوڕ و کچانە کەودەنن؟ ئەمانە بەباشی مێشکیان کارناکات؟ من بۆ ئەمکارە تاقیکردنەوەیەکم هەیە، کە لە ساڵانێك لەمەوبەرەوە ئەنجامیدەدەم. بە بڕوای من ئەڵبەتە هۆکارێکی نییە کە بەڵگەی لەسەر بێت و شتێکی زانستیش بێت. بەڵام هەرکەسێك بزانێت چەند ڕۆژێك لەمەوبەر چ خواردنێکی خواردووە و چی کردووە، یان هەرکەسێك بتوانێت لە حاڵەتی ئاساییدا، کۆکردنەوە و لێدەرکردن و چوار کرداری سادەی بنەڕەتی بیرکاری ئەنجامبدات. بەلای منەوە مێشکی سەلامەت و تەندروستە. ئەویتری بە ڕێژەیەکی زۆر بیرو باوەڕەکانمان پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە و خۆمان دروستیان دەکەین.

***

ماوەیەك لەمەوبەر خاتونێکی گەنج بەبێ کاتوەرگرتنی پێشوەختە، هاتبو بۆ نوسینگەکەم، منیش بە ڕێککەوت لەوێ بوم و بە پێداگری و بەدواداچون، بە کورتی چەند خولەکێك کاتی لێ گرتم. دواتر گوتم: باشە کچی خۆم کێشەی تۆ چییە؟ گوتی: (جەنابی موعەزەمی من هۆش و توانایيم کەمە و کێشەم هەیە و بەدەستیەوە دەناڵێنم. باوك و دایکم باوەڕیان وایە کە من گەمژە و کەم ئەقڵم و هەست و هۆشم بەلای خۆمەوە نییە و بەباشی ناخوێنم. تەنانەت منیان بردوەتە لای دەرونناس و ڕاوێژکاری خوێندن، ئەویش پشکنینی بۆ کردم و لەپاش پشکنینەکە گوتی کە تۆ باشتر وایە بڕۆیت و کارە پیشەییەکان ئەنجامبدەیت، تۆ ئەهلی خوێندن و قوتابخانە نیت.) من نازانم قسەکەی ئەو ڕاستە یان نا؟ بەڵام لێرەدا خاڵێك هەیە، ئەویش ئەوەیە کە (ئەگەر من باوەڕ بە شتێك بکەم و باوەڕبکەم کە بێتوانام، دەبێت بیسەلمێنم. ڕەفتارەکانی من نابێت وەك مرۆڤێکی هۆشیار بن، چونکە ئەوکات لەگەڵ بیروباوەڕەکانی مندا دەکەوێتە دژبەرییەوە. ئەگەر من باوەڕ بکەم کە ڕاستگۆیی کارێکی دروستە و درۆزنیش دوژمنی خودایە، ئەگەر باوەڕ بەمە بکەم ئەوکات ناتوانم درۆ بکەم.) ئەمە زۆر بە ئازارە کە ئەم کچە باوەڕی بەوە کردووە کە گێل و گەمژەیە. لەناو تێست و پشکنینەکەدا دەبێت ڕەفتار و هەڵسوکەوتێك نیشانبدات کە هەروەك گەمژەکان بێت. خۆ ئەگەر هۆشیار بێت ئەوە بیروباوەڕەکەی خۆی

هەڵوەشاندووەتەوە. خاڵی دواتر بریتیە لە دایکوباوکی کە هەمیشە پێی دەڵێن تۆ گەمژەیت. ئێمە وەك مرۆڤ پشتگیری سەرەتایی لە باوك و دایك وەردەگرین. چونکە متمانە بەخۆبون ڕەگ و ڕیشەکانی لە باسکردن و دەربڕینی گوفتار و ڕەفتاری دایکوباوکدایە، کە هەمیشە خەریکن بۆمبارانی دەکەن و پێی دەڵێن تۆ کەسێکی گێل و گەمژەیت.

من لێی دەپرسم بۆچی پێت دەڵێن گێل و گەمژەیت؟ لەوەڵامدا دەڵێت: پێم دەڵێن کچە مامەکەم لە فلأنە بەشدا دەخوێنێت، بەڵام من هێشتا دیپلۆمم بەدەست نەهێناوە. دیارە کە هەمیشە پێی دەڵێن تۆ توانات نیە، ئەویش باوەڕ دەکات کە گەمژەیە. لەولایەنەوە بەراوردی دەکەن، هەربۆیە ئەویش کاتێك دەکەوێتە بەرامبەر کچە مام و خزمەکەیەوە، دەڵێت هەمیشە گاڵتەم پێدەکەن و وەڵامم نادەنەوە و سوکایەتیم پێدەکەن. ئەم کچە وابیر دەکاتەوە کە خەڵکانیتر حەوسەڵەی وەڵامدانەوەی ئەمیان نییە، ئەمە لەکاتێکدایە ئەم بیرۆکەیە بریتیە لە کاردانەوە و ئاوێنەنوێنی فیکر و بیروباوەڕی خۆی. هەر خۆیەتی کە خۆی بە کەسێکی شیاو نازانێت و باوەڕی بەخۆی نییە، ڕەفتار و هەڵسوکەوتی جۆرێکە کە خەڵکانیتر هاندەدات بۆ ئەوەی کە (سەیرکەن من کەسێکی خۆشەویست نیم)، یان (سەیرکەن من کەسێکی بەتوانا نیم) یان

(سەیرکەن هیچکەسێك منی خۆشناوێت). هەرخۆیەتی ئەمکارە بەخۆی دەکات.

جاری یەکەم کە گەشتوە بە من، خۆ من پێشداوەری ناکەم، بەڵام ئەو بە ڕەفتارەکانی کارێك دەکات من هەستبکەم کە ئەو کەسێکی خۆشەویست و لەبەردڵان شیرین نییە. خۆشبەختانە من بەو نەخەڵەتام و بە پێچەوانەشەوە، من پێموایە ئەو کچە کەسێکی زۆر ژیر و هۆشیارە. سەیر ئەوەبوو کاتێك ئەم خاتونە ویستی لە نوسینگەکەم بچێتە دەرەوە، گوتی: جەنابی موعەزەمی باشە ئێستە من چی بکەم بۆ ئەوەی بەدواداچونکار و شێلگیر بم؟ منیش گوتم دەکرێت تکات لێبکەم کە لەمەودوا لەمبارەیەوە ڕاهێنان نەکەن. چونکە تۆ بەبێ کات وەرگرتنی پێشوەختە هاتون بۆ ئێرە و ئەوەندەش پێداگریتان کرد کە بتوانن کات وەربگرن! ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت من ببینن، سەرەتا دەبێت باسی مەسەلەکانی خۆیان بنوسن، بۆ ئەوەی من بزانم سەبارەت بە چ شتێك قسە دەکەین. ئەڵبەتە هۆکارگەلێکیتریشی هەیە. ئێوە بەبێ هەموو ئەم شتانە هاتون بۆلای من، منیش لەمە زیاتر بەدواداچون و شێلگیری بۆ تۆ ناکەم. هەموو هاوکارەکانم پێدەکەنین و خۆیشی پێدەکەنی.

***

باشە بۆچی ئەم بەڕێزە بیر دەکاتەوە و پێیوایە کە گەمژەیە؟ گەمژە نییە. هەرکەسێك کە زانی و گوتی من کەسێکی بێتوانام، ئەوە مرۆڤێکی زۆر بەتوانایە، بەڵام خۆی ئاگادار نییە. بەڵام

بەداخەوە ئەیەوێت بیسەلمێنێت کە بێتوانایە، یاخود سودێکی تێدایە بۆ خۆی کە بە کەسێکی بێتوانا خۆی نیشانبدات. چونکە نەگونجاوە کەسێك هەڵوەستە لەسەر خۆی بکات، بەڵام هۆش و زیرەکی نەبێت. ئێوە ئێستە هەڵوەستە لەسەر خۆتان دەکەن و دەزانن کە بونتان هەیە و دەزانن کە خەریکی خوێندنەوەی چ جۆرە بابەتێکن. هەربۆیە نەگونجاوە کەسێك هەڵوەستەی لەسەر خۆی هەبێت و بە خۆی بڵێت گەمژە. لەوانەیە بڵێت من حەزم لەوکارە نییە. یاخود من ئەوەم قبوڵە کە بڵێت من ئەوکارەم کردووە بەڵام داویانە لە زەوقم و دراوەتەوە بەنێوچاوانمدا. لە دڵم دراوە. ئەمەم قبوڵە. بەڵام کاتێك ئێوە چونە ناو دەستەواژەی پێوانە و بەرابەرکارییەوە، وەك ئەوەی (من لەگەڵ کچە مامەکەمدا، کوڕی خاڵەکەمدا و دراوسێکەم و....هتد جیاوازیم هەیە.) ئەمە ڕاست و دروست نییە. هیچ هۆکارێکیشی نییە هەر کارێك کە ئەوان بیکەن، منیش هەمان کار ئەنجامبدەم. من کێم؟ چارەنوسم چییە؟ پەیوەندییەکانم چین؟ خواستەکانم چین؟ من بۆ چ کارێك ئافرێنراوم؟

دواتر کاتێك لە ژیانی ئەم خاتونە گەنجە قوڵبومەوە، کۆمەڵێك ڕاستی تاڵترم بۆ ڕونبویەوە. ناوبراو گوتی من دایکمم خۆشدەوێت و بەوپەڕی خۆشەویستیەوە ئیش و کارەکانی ئەنجام دەدەم، بەڵام کاتێك کە کارەکانی تەواو دەبێت، لەبری ئەوەی کە سوپاسم بکات، دەڵێت: یارەبی ببیت بەژێر سەیارەیەکەوە و پان ببیتەوە. منیش

گوتم: تەمەنت چەندە؟ گوتی ٢٥ ساڵ. منیش گوتم ئێ باشە خۆ ئیتر تۆ منداڵ نیت کە چاوەڕێی قسەی ئەم و ئەو بیت. باشە بۆچی لکاویت بەم قسانەوە و ڕێگە دەدەیت کە هەمیشە پێت بڵێن تۆ گەمژەیت و هیچ توانایەکت نییە؟ سەیر ئەوەیە ئەم کچە کاتێك چوو بۆ بەشداریکردن لە خولی فێربونی کارە هونەری و دەستیەکان، ئێستە یەکێکە لە قوتابیە زۆر زیرەك و یەکەمەکان و کارانێکی زۆر داهێنانکارانە پێشکەش دەکات. باشە هەرگیز دەکرێت ئێمە کەسانێکی بێتوانا بین! باشە هەرگیز شتی وا دەبێت؟

***

(ئەوەی کە دەیبینین، باوەڕی پێناکەین، بەڵکوئەوەی کە باوەڕمان پێیەتی دەیبینین). ئەگەر ئێمە باوەڕمان بەوە کردووە کە بێتوانا و گەمژەین، ئەوکات هەمیشە خەریکین ئەمە دەسەلمێنین و لە هەر گۆشە و کەنارێکەوە شتێك دەدۆزینەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە لەسەر حەقین و ئێمە ڕاستدەکەین. چونکە ئەگەر بێت و مرۆڤێکی خەتاباریش بدۆزنەوە، هەرگیز ناڵێت من خەتابار و هەڵەم، بەڵکو یەکسەر دەڵێت باوك و دایکم بەمجۆرە بوون. من پارەم نییە، ئەو شتی زۆرە ملێم بەسەردا دەسەپێنێت، ئەو سەرمایەدارە و.... ئەمجۆرە بیانوانە بۆ خۆی دەهێنێتەوە، چونکە باوەڕی بەمجۆرەیە و بەپێی بیروباوەڕی خۆیشی دەجولێتەوە و ڕەفتار دەکات. ئێمە لەکوێ و سەروەت و سامان لە کوێ؟ ئێمە چیمانداوە لە خۆشگوزەرانی؟ (گلێم و توێشەبەرەی هەرکەسێکیان

بە ڕەش دوریبێت، بە ئاوی زەمزەم و ئاوی کەوسەریش سپی نابێتەوە!) بیروباوەڕی ئەو ئەمەیە، یەکێك لە ڕێگەکانی چەسپینی بیرو باوەڕەکانیش دووبارە کردنەوەیە. بەتایبەت لەلایەن کەسانێکەوە کە ئێمە باوەر و متمانەمان پێیان هەیە و پێویستمان پێیانە. ئەگەر مامۆستا بە قوتابیەکەی بڵێت تۆ گەمژەیت، ئەگەر بێت و قوتابیەکە ناوبراو بە خاوەن تێڕوانین و بیرو بۆچونی پەسەند بزانێت، یاخود کەسێك کە ڕاوێژکاری کۆمەڵایەتیە و ئێمە بەلامانەوە جێگەی متمانەیە و کەسێکی پەسەندە. ئەگەر ئەم کەسانە بە ئێمە بڵێن تۆ گومژەیت، ئەوکات بەدڵنیاییەوە ئێمەش لە توانا و لێهاتنی خۆماندا دەکەوینە گومان و دودڵییەوە.

***

تکا دەکەم با بوەستین و دەموچاومان بشۆین و هەرکاتێك ئەمانەوێت ڕەخنە لە خۆمان بگرین، بزانین کە ئێمە شارەزای خۆمانین و هەڵوەستە لەسەر خۆمان دەکەین، ئەمەش لە هۆشیاری و زیرەکی ئادەمیزادەوەیە. با شانازی بە مرۆڤبونی خۆمانەوە بکەین و سەربەرز بین و قەدری بزانین. چونکە تەمەنێکی کەم لێرەوە دەستپێدەکات لێرەشدا کۆتایی دێت. کاتێکی زۆر سنوردارە، ئێمە لەناو باڵاترین فۆڕمی ژیان و ئاڵۆزترین شێوەی ژیان واتە (مرۆڤ)داین. ئەمە خۆی بۆخۆی بەخششێکی گەورەیە کە هەڵێکیان بەناوی تەمەنەوە بە ئێمە داوە. هەربۆیە پێوستە بەباشی سودی لێوەربگرین و لەمە بەدواوە بیرێك بکەینەوە. ئەگەر هاندانمان نییە،

با بەلایەنی کەمەوە بێدەنگ بین، و سوکایەتی بە کەس نەکەین. ئەگەر دەمانەوێت سوکایەتی بکەین، با بەخۆمان بڵێین نەکا ئاستی متمانەو باوەڕم بەخۆم نزم بێت، نەکا من خۆم پێوانە و بەرابەر دەکەم لەگەڵ کەسێکیتردا. با ووزە بە منداڵەکانمان و خەڵکانی دەوروبەری خۆمان بدەین. ئەگەر پزیشکێکی نەشتەرگەری دڵ کە پسپۆڕە و ئەندازیارێك کە سەدەکان دروستدەکات و پۆلیسێکی چەلەنگ و دانا کە دزەکان دەستگیر دەکات و ئەو دادوەرانەی کە بەباشی دادوەری دەکەن و ئاسایش دەبەخشنە کۆمەڵگە، زیاتر لە ئێمە دەزانن، باشە با بیزانن، خۆ ئەوە لەبەرژەوەندی و سودی ئێمەیە و دەبێت ئافەرینیان بکەین. با هانی منداڵە باشەکان و خەڵکانی دەوروبەرمان بدەین و لەسەر کارو ئاکارە باشەکانیان ئافەرینیان بکەین، بۆیان بسەلمێنن کە ئەوان کەسانێکی بەتوانان، ئەوەش بزانین کە ئەم توانایيە دەبێت هاوپێچ بێت لەگەڵ ئەرك و لێپرسراویەتیدا و نەڵێین تۆ کەسێکی بەتوانایت، هەر لەبەر ئەوەیە کە دەرگاکانت بۆ دەکرێنەوە. بەڵکو بڵێین تۆ کەسێی بەتوانایت و دڵنیابە کە ڕێگەکەی دەکرێتەوە، تۆ دەزانیت ڕێگەکەی بدۆزیتەوە و منیش پشتیوانیت لێدەکەم.

هیوادارم ڕۆژێك بێت کەسێك یاخود کەسانێك بەتایبەت گەنجەکان نەیەن و بڵێن بۆچی من گەمژەم. ئەگەر پرسیارەکانمان بە هەڵە خستبێتەڕوو، ئەگەر زانیاری ڕاست و دروستمان نەبێت، ئەگەر بەباشی بەڵگەمان بۆ شێوەی مەسەلەکە نەهێنابێتەوە و ئەگەر لە

زمانی ئێمە تێنەگات و نەتوانێت بەباشی وەڵامی پرسیارەکانی ئێمە بداتەوە، ئەوە کەسێکی گەمژە نییە، بەڵکو پەیوەندییەکە هەڵەیە. منیش لێپرسراوم کە قبوڵی بکەم لەو پەیوەندیەدا پشکدارم. هەرکاتێك واتانزانی کەسێك گەمژەیە، تکاتان لێدەکەم کەمێك بوەستن و گومان و دودڵیتان لە بیروباوەڕەتاندا هەبێت. چونکە دڵنیابن کە مرۆڤی گەمژە بوونی نییە.

## "وتوویژ" لە یاری ژیاندا سەرکەوتوتان دەکات

ئەگەر سەرنج بدەن زۆربەی کات و ژیانی ئێمە لەوەدا سەرف دەکرێت کە باوەڕ بە خەڵکانیتر بهێنین و ڕازیانبکەین کە کارێکمان بۆ بکەن و بەردێك لەبەرقاچماندا لاببەن و هاوکاریمان بکەن و یارمەتیمان بدەن، ئێمەیان خۆشبوێت و.... هتد، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر باوەڕ بەخۆمان بهێنین کە ئەمکارە دروست یاخود هەڵەیە.

***

ئەم هونەری (خۆڕازیکردنە) هێندە بەنرخە کە ساڵانە بە ملیاران ملیار دۆلار لەپێناویدا خەرج دەکرێت بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە بکرێت کە مرۆڤێك بەچ شێوەیەك باوەڕ بە شتێك دەهێنێت. یاخود مرۆڤێك چۆن ڕازی دەکرێت. هەروەها چۆن یەك مرۆڤ بڕیارێك دەدات.

قۆناغەکانی بڕیاردانی چین و ئێمە چۆن دەتوانین بچینە ناو ئەم قۆناغانەوە و ئەو ڕەوتی بڕیاردانە بەرەو خۆمان بسوڕێنینەوە.

***

یەکێك لە دیارترینیان بریتیە لە ڕیکلامە بازرگانییەکان. بەیانی تاوەکو ئێوارە بەرنامەکانی ڕیکلامە بزرگانیەکانی تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ (لەم سالأنەی دوایشدا ئینتەرنێت و ئیمەیل و تۆڕە کۆمەلأیەتیەکان و...هتد) ئەیانەوێت باوەڕ بە ئێوە بهێنن و ڕازیتان بکەن کە فلأنە بەرهەم یان خزمەتگوزاری بکڕن، ئەوە دەخەنە پێشچاوتان کە بەلێ لەوانەیە بەرهەم و کالأکانی ئێمە کەمێك گرانتر بن، بەلأم خاوەنی ئەم کوالێتی و تایبەتمەندیانەن.

***

یاخود مندالەکەتان ئەیەوێت باوەڕ بە ئێوە بهێنێت و ڕازیتان بکات کە بۆ نمونە میزەلأن یان پاسکیلی بۆ بکڕن، یاخود ئەیەوێت باوەڕتان پێبهێنێت کە بیبەن بۆ پارکی یاری یاخود سینەما. یاخود باوەڕ بە ئێوە بهێنێت بۆ ئەوەی درەنگ بخەوێت. یاخود بە پێچەوانەوە ئێوە دەتانەوێت باوەڕی پێبهێنن کە پێش خەوتن دەموددانەکانی بشوات. یاخود پێش خەوتن کتێب بخوێنێتەوە.

***

کەوابوو ئەگەر سەیربکەین، دەبینین کە هەمیشە لە هەوڵ و کۆششداین بۆ ئەوەی تێڕوانینی کەسێك یاخود چەند کەسێك لەبەرژەوەندی خۆمان بگۆڕین. ئەمە زۆر گرنگە. ئەگەر ڕێگەکەی

بزانین، ئەگەر لە حاڵەتێکی ئاساییدا باوەڕهێنان بە کەسێك و ڕازیکردنی ٣ ساڵ یان ٦ مانگ یاخود ٤ سەعاتی خایاندبێت، لەوانەیە بەمشێوەیە ٥ خولەك بخایەنێت. کەوابوو ئەوە دەهێنێت کە فێری شێوازی باوەڕهێنان و ڕازیکردنی خەڵکانی بەرامبەرمان ببین.

***

ئێمە بونەوەرانێکی کۆمەڵایەتین. بونەوەرانێکن کە تێگەیشتوین سەرکەوتنمان لە گرەوی بڕیار و خواستی خەڵکانیتردایە. ئەم هەموو مۆدێلە، ئەم هەموو جلوبەرگە، ئەم هەموو بۆن و عەتر و قۆڵانی و مادە ئارایشتیەکان، هەر هەمویان بۆ باوەڕپێهێنان و ڕایزکردنی ئێمەیە. کە سەرنج بدەرە من، من لێرەدام. بەلای ئێوەوە سەرنجڕاکێش و کەمێکیش جێگەی داخ نییە کە بۆچی ئێمە ئەم هونەر و لێهاتویی و شارەزاییەی ژیان لە قوتابخانە یان دواناوەندی یاخود زانکۆ وەك وانەیەکی چێژ بەخش ناخوێنین؟ بۆ ئەوەی منداڵەکەمان فێری ئەوە ببێت لەبری شەڕکردن و هات و هاوار و تێکدان و ڕوخاندن، فێری قسەی جوان ببێت و فێری ئەوە ببێت کە چۆن باوەڕ و قەناعەت بە بەرامبەرەکەی خۆی دەکات و ڕازی دەکات کە قسە و گوفتارەکانی ڕاست و دروستن.

***

پێش هەموو ئەمانەیش، تاوەکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، هەموو هونەرەکانی وتوویژ لەسەر ئەوە وەستابوو کە من بیبەمەوە و لایەنی بەرامبەریشم بیدۆڕێنێت. هێشتا لە هەندێك کارو

کەسابەتەکاندا سێبەری ڕەشی ئەم ڕەفتارە بەردەوام دەبینرێت، کە بەرامبەرەکەی بیر لەوە ناکاتەوە موشتەری یان کڕیارەکەی یاخود ئەو کەسەی کە سەردانی کردووە چ سود و قازانجێکی دەستدەکەوێت. بەردەوام بیر لەوە دەکاتەوە کە چی بکات بۆ ئەوەی کە خۆی سود و قازانجێکی زیاتری دەستبکەوێت. تەنانەت لە وتووێژی نێوان دەوڵەتەکانیشدا، ئەمە زۆر باوی هەبووە و لەوانەشە هێشتا هەر بوونی هەبێت، کە هەریەکە لە دەوڵەتان تەنها بیر لە سود و بەرژەوەندییەکانی وولاّتەکەی خۆیان دەکەنەوە و بەهیچ شێوەیەك بیر لە بەرژەوەندی وولاّتی بەرامبەریان ناکەنەوە. ئەمە لەزاراوەی بێگانەدا دەکاتە (براوە- دۆڕاو). لەمشێوازی براوە- دۆڕاوەدا بە ڕواڵەت من بردومەتەوە. بەلاّم ئەگەر بڕیارنامەیەك واژۆ کراوە و ئەم بڕیارنامەیەش دەبێت جێبەجێ بکرێت، ئەوکات کەسی دۆڕاو ناتوانێت و نایەوێت جێبەجێی بکات، ئەمەش بە شێوەیەکی پێویست نابێتە هۆی جێبەجێکردنی بڕیارنامەکە.

***

مرۆڤە زیرەك و هۆشیارەکان بە زویی تێدەگەن کە لە پەیوەندییەکانی براوە - دۆڕاودا، هەردولا دۆڕاون. خۆ شێوازی دۆڕاو- دۆڕاویش بەهیچ شێوەیەك جێبەجێ ناکرێت.

لەناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەم بەملاوە، گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە شێوازی گونجاو بریتیە لە شێوازی براوە- براوە. واتە لەو پەیوەندیانەی کە هەمانە، هەم ئێوە خێر و سود وەربگرن و

هەم ئێمەش قازانج دەکەین. بۆ نمونە ژن و مێردەکان هەردوکیان لە بڕیارنامە و یاساکان خۆشحاڵ بن. لە فەرمانگەیەکدا هەم کارمەندەکە خۆشحاڵ بێت و هەم فەرمانگەکەش. هەم مامۆستا خۆشحاڵ بێت و هەم قوتابی. لە بڕیارنامەی بازرگانیدا هەم دەبێت کڕیار و هەم فرۆشیار خۆشحاڵ بن. لەمشێوەدایە کە هاوسەنگی لەناو کۆمەڵگەدا دەپارێزرێت. سکاڵای کەموکوڕییەکان کەمتر دەبنەوە و کارەکان باشتر بەڕێوەدەچن. بەڵام دیسانەوە مرۆڤ لەو جێگەیەوە کە ئەزمون دەکات فێر دەبێت، لەم چەند ساڵەی کۆتاییدا کۆمەڵێك شت گوتراوە کە ڕێگەچارەی براوە- براوەش بەس نییە. باشە چۆن بەس نییە؟

***

من و ئێوە ڕێکدەکەوین کە ئەم کاڵایە ئێوە دروستی بکەن و منیش لە ئێوەی بکڕم. دواتر من ساردییەك لە ئێوە دەکڕم، شیرینیتان لێ دەکڕم یاخود بەرهەمێکی خۆراکیتان لێدەکڕم و دەڕۆم بۆ شوێنێکی گەشتیاری و بوتڵی ساردییەکە یان پاکەتی مادە خۆراکیەکە دەخەمە ناو جۆگەیەکی ئاوەوە و دواتریش دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە. ئێوە خۆشحاڵن بەو نرخەی کە ویستوتانە و کاڵاکەتان فرۆشتوە، منیش خۆشحاڵم ئەو نرخەی کە ویستومە کڕیومە و لە کوالێتی و چۆنیەتیەکەیش ڕازی بوم. لێرەدایە کە من و ئێوە براوەین. بەڵام ژینگە و منداڵەکانمان و شوێنی گەشت و تێچوی شارەوانی بۆ پاککردنەوەی ئەو شوێنە، هەمو ئەمانە دۆڕاون.

با بێین بۆ شارەکەی خۆمان. ئێوە دەڵێن ئەم درەختە ببڕنەوە، شارەوانیش دەڵێت ئێمەش ئەوەندە غەرامە دە کەین و ڕێگە دەدەین ببڕدرێتەوە. ئێوەش پارە دەدەن و بیناو باڵەخانە دروستدەکەن، بۆ نمونە مەتری بە ٥ ملیۆن تمەن ئەو شوێنە دەفرۆشن. لێرەدا هەردولاتان واتە هەم ئێوە و هەم شارەوانیش خۆشحاڵن. بەڵام درەختەکە خۆشحاڵ نییە. ئەو خەڵکەی کە بە ئۆکسجینەکەی هەناسەیان دەدا و تەنانەت منداڵەکانیشتان خۆشحاڵ نین. چونکە شارێك کە درەختی تێدا نەبێت شار نییە. شارێك کە باڵندە و پەپولەکانی تێدا نەفڕێت، شار نییە.

***

ئێستە براوە- براوە - براوە، شێوازێکە کە دەخرێتەڕوو، مرۆڤی سەرکەوتوی ئەمڕۆکە بە شێوازی براوە- براوە- براوە بیردەکاتەوە. من و ئێوەش دەبێت براوە- براوە- براوە بیر بکەینەوە. واتە ئەگەر من فرۆشیارم و ئێوەش کڕیار، تەنها هێندە بەس نییە کە تەنها من و ئێوە خۆشحاڵ بین. بەڵکو دەبێت دەرئەنجامەکانی ئەم مامەڵەیە لە سود و بەرژەوەندی خەڵکانیتریشدا بێت. ئەوکاتەیە کە ئەم بڕیارنامەیە گەشە دەکات، چونکە نەك تەنها من و ئێوە بەڵکو کۆمەڵگەش پشتیوانی و پارێزگاری لێدەکات.

داتاشینی زەوی دارستان و فرشتنی، زیان بە ژینگە و خەڵکانیتر دەگەیەنێت. توێژی بەپیتی زەوی بەرهەمدار بەلایەنی زۆرەوە ٥ سانتیمەترە. بۆ ئەوەی کە ٥ سانتیمەتر خاکی بەپیت بەدی

بهێنیرێت، نزیکەی ٥٠٠ ساڵ کاتی دەوێت تاوەکو ئاوو هەواو هەلومەرج و بەکتریاکان دەست بخەنە ناو دەستی یەکترییەوە و توێژێکی بەپیت بەرهەم بهێنن. ئەوکات ئێمەش دێین و دارودرەختەکان دەبڕینەوە و دایاندەتاشین، دواتر بارانێك دەبارێت و ئەو توێژاڵە بەپیتە لەناو دەچێت و ڕوبارەکانمان پڕ دەبن لە خۆڵ و لیتە، جۆگەلەکانمان لەناو دەچن، ئاوەکانی ژێر زەویمان لەناو دەچن و وادەزانین کە براوە بوین و زەوییەکمان وەرگرتووە. لەکورت مەودادا ئەمە وایە، بەڵام لە مەودایەکی دورودرێژدا هەرهەمومان دۆڕاوین. وابزانن کە هەموو زەوییە گرانبەهاکان هی من و ئێوە بێت. بەڵام جۆگەلە ئاوەکان بۆنیان بێت و هەواکە ژەهراوی بێت و درەختێکیش لەزەوییەکەدا نەبێت. ئایا دەکرێت لە شوێنێکی لەمجۆرەدا مرۆڤ بژی؟ تەنانەت ئەگەر ڕۆژی ١٠٠ ملیۆن تمەنیش داهاتمان هەبێت. ئەمە چ سودێکی هەیە؟!

***

با بێین و لێهاتن و شارەزاییەکانی وتووێژ و هونەرەکانی بکەینە بەشێك لەو وانە و بابەتانەی کە فێربونیان بۆ خۆمان بە ئەرك و واجیب بزانین. فێر ببین کە چۆن بیربکەینەوە و چۆن وتووێژ بکەین. منداڵەکانمان فێری ئەوە بن کە چۆن قسە و گفتوگۆ لەگەڵ هاوپۆلەکانیاندا بکەن و بیرو باوەڕی خۆیان بگوازنەوە بۆ بەرامبەرەکانیان. ئەوکاتەیە کە ژیان بۆیان ئیسراحەت و بەرهەمدار دەبێت. ئەم لێهاتن و شارەزاییە زۆر بەنرخ و سەرنجڕاکێشە، شتێکە

کە مرۆڤ دەتوانێت فێری ببێت. ئەم لێهاتنە زگماکی نییە. بەڵام فێری دەبین. منداڵەکان کاتێك دەبینن کە دایکوباوکیان بەیەکەوە و لەگەڵ خەڵکانیتردا چۆن قسە و گفتوگۆ دەکەن، ئەوانیش وەك ئەوان فێر دەبن.

***

بابێین و شۆڕش و ڕاپەڕینێك دروستبکەین. لە لێپرسراوانی پەروەردە و فێرکردن، مرۆڤە دڵسۆزەکان و کۆمپانیاکانەوە هونەری گفتوگۆو وتووێژ فێر ببین. ئێوە ئەگەر فێری شێوازی فرۆشیاری و باوەڕهێنان بە موشتەری و ڕازیکردنی ببن، ئەوکات خەڵکی بە ئاسانی شتومەك و کاڵاکانتان لێ دەکڕن، داهاتیشتان بەرز دەبێتەوە، ئەوان خۆشحاڵ دەبن و ئێوەش بەهەمانشێوە خۆشحاڵن. ئێستە دەزانن کە ژینگەکەتان و مرۆڤەکانیتریش دەبێت خۆشحاڵ بن. ئەم هونەرە شتێکە کە مرۆڤ دەتوانێت فێری ببێت، من و ئێوەش دەتوانین بە ڕاهێنان ئەمە لە خۆماندا بەدی بهێنین. هونەرێك کە زۆر چێژ بەخشە، هونەرێك کە تەمەن درێژ دەکات، ژیان بۆ مرۆڤ ئاسان دەکات، تێچوی کارەکان دەهێنێتە خوارەوە. مرۆڤەکان ئاسانتر دەرك دەکەن و ئاسانتر بەیەکتریدا ڕادەگەن و سەیر ئەوەیە ئەو کەسانەی کە هونەرەکانی گفتوگۆ و وتووێژ دەزانن و ڕاهێنانیان کردووە، ئاسانتریش باوەڕ دەهێنن و ڕازی دەبن. وتووێژ شەڕو ئاژاوە نییە، کە براوە و دۆڕاوی تێدا بێت.

ڕۆژێکیان من لەگەڵ کەسێکدا کێشەی دارایيم هەبوو، پێی گوتم ئەگەر دەکرێت یەك ملیۆن تمەن خەرج بکەم، ئەمکارە دەکەم بۆ ئەوەی سەدهەزار تمەن لە تۆ وەربگرم. منیش پێمگوت کە دەکرێت تکاتان لێبکەم کە لەو یەك ملیۆن تمەنە ٩٠٠ هەوار تمەن بکەیت بەدوو بەشەوە و نیوەی بدەیت بەمن بۆ ئەوەی ئەو سەدهەزار تمەنە بدەم بە ئێوە ! چونکە بۆ سەد هەزار تمەن دەبێت بەلایەنی زۆرەوە ١٠٠ هەزار تمەن کات خەرج بکەیت، نەك زیاتر. ئەوەش بزانە کە ئەمە وتووێژە، خۆ ئینکاری و ملەجەڕێ نییە. کاتێك ئێمە ملەجەڕێ و توندوتیژی و بێتامی دەکەین، لەبەر ئەوەیە کە هونەرەکانی وتووێژ نازانین. کاتێکیش هونەرەکانی وتووێژ نەزانین، ئەمەیە کە ئێمە خاوو لاڵین و ئەمانەوێت لەگەڵ مرۆڤێکی گۆیادا قسە بکەین. ئەو دەتوانێت و ئێمە ناتوانین. هەست بە بچوکی خۆمان دەکەین و خۆمان بە کەم دەزانین. توڕە دەبین. هێرش دەکەین.

***

(براتراند راسل) ڕستەیەکی زۆر جوانی هەیە. دەڵێت: (کاتێك کەسێك توڕە دەبێت، لەلای من ماناکەی ئەوەیە کە لۆژیکی تەواو بووە و ئیتر هیچ مەنتیق و لۆژیکێکی بۆ گوتن نییە). توندوتیژی شەڕو ئاژاوە، کاتێك دەستپێدەکات کە لۆژیك تەواو دەبێت. لە کاتێکدا بە فێربونی هونەری گفتوگۆ، کۆمەڵگەی ئێمە لە ئاشتیەکی زیاتردا دەژی. دادگاکان چۆڵتر دەبن. پۆلیسخانەکانیش چۆڵ دەبن.

ئەوكات پۆلیس کاتێکی زیاتری بۆ کۆنترۆڵ و پێشگیری لە تاوانەکان دەبێت، نەوەك کاری ببێتە بەدواداچونی سکاڵا منداڵانە و بێماناکان.

***

ئەگەر لەگەڵ مندا هاوڕان، دەی هەر لە ئەمڕۆوە دەستپێبکەن. من و دەزگاکەم لە خزمەتی ئێوەداین. بۆ فێربونی ئەم هونەرە جوان و بەرهەمدارە، شوێنانێکی تریش هەن کە دەتوانن سەردانیان بکەن. بەڵام هەر دەبێت ئەوە فێر ببین کە ئەمکارە فێری منداڵەکانیشمان بکەین و تکا لە لێپرسراوانی پەروەردە و فێرکردنیش بکەین کە وانەیەك بەناوی ڕازیکردن و هونەری وتووێژ بخەنە ناو وانەکانی قوتابخانەوە، بۆ ئەوەی ئێمە فێری ژیان و ئاسان ژیان ببین و ئەزمونی بکەین و بە شادومانتر و خۆشبەختتر بژین.

## لە دەروونی منی دڵ ماندودا، نازانم کێیە...

بۆچی هێندە مەودا هەیە لەنێوان ئەوەی کە دەیڵێین و ئەوەی کە بەڕاستی هەین و ئەنجامیدەدەین؟ بۆچی بەو شتەی کە بانگەشەی بۆ دەکەین، ئەوەندە مەودامان لەگەڵیدا هەیە؟ بۆچی هێندە مەودامان لەگەڵ ئەو وێنەیەدا هەیە کە لەناو زەینی خۆماندا لە خۆمان هەمانە؟ بە یارمەتی دەروونناسی، ئەم بابەتە کەمێك کراوەتەوە: لە ڕاستیدا مەودا هەیە لەنێوان ئەوەی کە ئێمەی مرۆڤ دەیڵێین و ئەوەی کە بەکرداری ئەنجامیدەدەین.

بەدڵنیاییەوە ئەم مەسەلەیەش هۆکاری هەیە. ئایا ڕێککەوتوە بڕیار بدەن، یان وەرزش بکەن و ئاگاداری خواردنەکانتان بن، یان ئەگەر فلانەکەس قسەیەکی کرد، توڕە نەبن و کۆنترۆڵی خۆتان لەدەست نەدەن؟ بە گریمانی زۆرەوە وەڵامدەدەنەوە و دەڵێن: (چەندینجار!) چەندینجار لەبەر خۆتانەوە بڕیارتانداوە، بەڵام لە کرداردا دەبینن کە نەتانتوانیوە بەوجۆرەی کە بڕیارتان دابوو کاری پێبکەن. دیسانەوە وەك جاران توڕە بوونەوە. هەروەك جاران هاوار دەکەن و هەروەك جاران بێدەنگ دەبن و هیچ قسەیەك ناکەن و

دواتر پەشیمان دەبنەوە کە بۆچی، قسەکەتان نەکرد، لەوانەیشە سەرتان سوڕبمێنێت بۆچی ڕەفتار و کردارەکانتان ئەوەندەی کە دەتانەوێت بەویست و ئیختیاری خۆتان نییە؟ جوانترین قسە لەمبارەیەوە (حافیز)ی شاعیر لەم بەیتەدا باسی دەکات و دەڵێت:

در اندرون من خسته دل ندانم کیست

که من خموشم و او در فغان و در غوغاست

واتە: لەناو دەرونی منی دڵی ماندودا نازانم کێیە، کە من خامۆشم و ئەو لە شین و غەوغادایە.

ئەم جیاییە جیایی (ئاگا) لە (ناخودئاگا)یە، کە لەم بەیتەدا بەڕونی باسکراوە. بەڕاستی شتێك هەیە کە لەدەرونی ئێمەدایە کە بەشێوەیەکی ئاگایانە کۆنترۆڵمان بەسەرییەوە نییە. هەمان ئەو ناخودئاگایە لە دەروونناسیدا ئاماژەی پێدەکرێت و لەوانەیە ئێوەش بەباشی ئاشنایەتیتان لەبارەیەوە هەبێت. ئەڵبەتە لەنێوان خودی ئاگا و ناخودئاگادا حاڵەتێکیتریش بوونی هەیە. بەڵام بۆ ئەوەی کە باسەکە ئاڵۆز نەکەین، تەنها ئەوە بەبەس دەزانین کە ئێمە لەناو بون و وجودماندا دوو بەشمان هەیە: بەشێکی (ئاگا) و بەشێکی (ناخودئاگا).

لەبەشی ناخودئاگادا کارانێکی زۆر ئەنجام دەدرێن، کە ئێمە لێیان بێئاگاین. بۆ نمونە، ئێستە کە ئێوە خەریکن ئەم ووشانە دەخوێننەوە، دەیان و بەڵکو سەدان بزوێنەری تر بەردەوام مێشکی ئێوەش سەرقاڵی وەرگرتنە: دەنگی ناو شەقام، دەنگی منداڵ، بۆنی

خواردنی ناو چێشتخانه، دەنگی تەلەفیزیۆنی دراوسێکەو...هتد. مێشکی ئێوە بەجۆرێك بەرنامەڕێژی کراوە کاتێك ئەم بزوێنەرانە وەردەگرێت، ئەگەر پێویست بێت، ئەوا بەلایەنی کەمەوە دوو کاردانەوە بەرامبەریان نیشاندەدات. ئەگەر پێویست بێت ئەوا دەینێرێت بۆ بەشی ئاگاتان. بۆ نمونە دەڵێت خواردنەکە بەسەر مەنجەڵەکەدا ڕژاو هەڵچوو. جەرەسی دەرگایان لێدا، منداڵەکە خەبەری بویەوە، یاخود بۆ نمونە پەنجەرەکە کراوەتەوە. ئێستە هەوا دێت. بە ئێوە دەڵێت ئەم دەرگایە دابخەن، بەشوێن منداڵەکەدا بڕۆن، یان بۆ نمونە دەنگی تەلەفیزیۆنەکە کەم بکەنەوە. لەمجۆرە حاڵەتانەدا ئێوە بۆ ئەنجامدانی کاری گونجاو هاندەدرێن و دەستبەکار دەبن. لە حاڵەتی دووەمدا خودی مێشك بە شێوەیەکی خۆکار (ئۆتۆماتیك) لەبەرامبەر بزوێنەری وەرگیراوەوە کارێك ئەنجام دەدات، بەبێ ئەوەی کە ئێوە ئاگاداریتان لەبارەیەوە هەبێت. بۆ نمونە خەریکن سەیری بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنی دەکەن و لەهەمانکاتدا هەستیش بە گەرما دەکەن. مێشکی ئێوە بەبێ ئەوەی کە هیچ شتێك بە ئێوە بڵێت دەستدەکات بە ئارەقکردن، ئەگەریش سەرماتان بوبێت ئەوا دەستدەکات بە گرژبونەوە، ئەگەر بەتانیەك لەبەردەستاندایە، دەیدەن بەسەر قاچتاندا بەبێ ئەوەی کە ئاگاتان لە خۆتان بێت. کاری ناخودئاگا بریتیە لە ئاسانکاری ژیان و خێرایی بەخشین بە مەسیری ژیان. هەر لەبەر ئەمەیە کە مرۆڤە سەرکەوتوەکان مرۆڤانێکن کە ناخودئاگاییەکی سەرکەوتویان هەیە.

مرۆڤە ناسەرکەوتوو شکستخواردوەکانیش ئەو کەسانەن کە ناخود ئاگایەکی ناسەرکەوتوو شکستخواردویان هەیە. واتە ناخودئاگایان زانیارییەکان وەردەگرێت، بەلاّم لەسەر بنەمای ئەو بەرنامەیەی کە لەپێشەوە بەویان داوە (کە بەرنامەیەکی هەڵە بووە) ئیش و کار دەکات.

***

بوونی ئەم مەودایانە لەنێوان ئاگا و ناخودئاگادا، لەبەر ئەوەیە کە ئاگای من دەڵێت ئەگەر پشت بەم کەسە یان بەو فلاّنەکەسە ببەستیت، ژیانت باشتر دەبێت، داهاتوت ڕۆشنتر دەبێت. بەلاّم لەناو ناخودئاگایشدا شتێکیر سازو ئاوازی خۆی لێدەدات. ئێمە دەبێت فێری ئەوە ببین کە (ئاگا) و (ناخودئاگا) پەیوەست بکەین بەیەکترییەوە. واتە بە مێشکمان بیر بکەینەوە و ڕرێگەچارە بدۆزینەوە و بە ناخودئاگامان جێبەجێی بکەین. ئەگەر بمانەوێت کارێك تەنها بە ئاگامان ئەنجامبدەین، ئەوا زەحمەتێکی زۆرمان دەبێت. ئێوە پیتانوایە ژەنیەرێکی کەمانچە یان ژەنیەرێکی پیانۆ یان هەر سازێکیتر، لەکاتی ژەنیندا بیر لەوە دەکاتەوە کە دەبێت پەنجەم بەری ئەم دوگمەیە بکەوێت و ئەو دەستەیشم بەو دوگمەیەی تر؟ ئەگەر ژەنیەر بیەوێت بەمشێوەیە بیربکاتەوە و هەڵسوکەوت بکات، ئەوکات موسیقایەك لە ئارادا نابێت! ئەو تەنها بە خۆی دەڵێت کە ئەمەوێت بۆ نمونە پارچەی ژمارە پێنج لێبدەم، دواتر دەستدەکات بە ژەنین. ئەگەر بیەوێت بیر بکاتەوە، واتە زەمیری

ئاگای بهێنێته ناو کاری ژەنینەوە، کارەکە خراپ دەبێت. کەوابوو ژەنینی سروشتی و ژەنینی باش، کارێکە کە بە ناخودئاگا ئەنجامدەدرێت.

دەزانم هەموتان دەتانەوێت سەرکەوتو بن، سەرکەوتنیش لە بیرو زەینی هەریەکەتاندا جیاوازە، لەبەر ئەمەیە لە کرداردا ناسەرکەوتون. کاتێك بەمجۆرەیە، دەبێت ئەوەتان لەبیر بێت کە گرفتی کارەکە لەوەدایە کە ئێوە دەتانەوێت تەنها بە فیکرتان (بە ئاگاتان) ئەمکارە ئەنجامبدەن. بەڵام بەپێچەوانەوە دەبێت بتوانن خواست و هێزی ناخودئاگاتان لەمکارەدا بەشداری پێبکەن. وەگەرنا کارەکەتان دەگۆڕدرێت بە شکست و دڵساردی.

بەدڵنیاییەوە ئێستە دەپرسن چۆن؟ ئێستە لە خزمەتتاندا عەرزی دەکەم. بۆ ئەوەی کە ڕێگەی چونەناوەوە بۆ ناخودئاگاتان پەیدا بکەن، شێوازگەلێکی سادە بوونیان هەیە کە یەکێکیان (زیکر و تەڵقینە).

ئەگەر بەردەوام دەستەواژە یاخود بابەتێك بە خۆتان تەڵقین بکەن و دووبارەی بکەنەوە. پاش ماوەیەکی کاتی کە ٢١ ڕۆژە ئەو دەستەواژە و بابەتە دەچێتە ناو ئاستی ناخودئاگاتان و ئیتر بەبێ ئەوەی کە ئاگاتان لە خۆتان بێت و (بەبێ ئەوەی کە پێویست بکات بیری لێبکەنەوە) ئەوکارە ئەنجام دەدەن. ڕەمزی ئەم تەڵقینانەش لەوەدایە کە ڕستەکان بە (کاتی سادەی ئێستە) و (لە دەستەواژەگەلێکی کورتدا) و (بەشێوەیەکی ئەرێنی) بڵێنەوە. بۆ

نمونە لەبری ئەوەی کە بڵێین (من جگەرە ناکێشم و تەندروستی خۆم ناخەمە مەترسییەوە) یاخود (ئیتر توڕە نابم و کۆنترۆڵی خۆم لەدەستنادەم، چونکە زیانم پێدەگات)، ئەمشتانە بڵێین: (من جگەرەم وازلێهێناوە) یاخود بڵێین: (من هەوای پاك هەڵدەمژم)، (من تەندروست و گەشبینم)، (من هێمن و لەسەرخۆ دەجوڵێمەوە)، (من بەتەواوەتی هێمن و ئارامم). چونکە لەزەمیری ناخودئاگای ئێوەدا جگەرە نەکێشان یاخود توڕە نەبوون بەڵگە نین لەسەر ئەنجامدان و ڕەفتاری ڕاست و دروست. با گریمانی ئەوە بکەین کە ئێوە توڕە نەبن، ئەمە بەڵگەی ئەوە نییە کە کارێکی دروست ئەنجام دەدەن. چونکە مردوەکانیش توڕە نابن! بۆ نمونە، لەبری ئەوەی کە بڵێین، (من خەموپەژارەم نییە)، بڵێین: (من شادومانم، من شادومانم...)، هەر ئەمەش دووبارە بکەنەوە.. دوبارەی بکەنەوە.... دوبارەی بکەنەوە.... لەوانەیە پێکەنین بتانگرێت و باوەڕ بە قسەکانی خۆتان نەکەن، بەڵام هیچ کێشە و گرفتێکی تێدا نییە. بەڵکو تەنها بیڵێنەوە و بەردەوام دووبارەی بکەنەوە. بەردەوام بە هێمنیەوە بڵێن: من شادومانم.... من شادومانم... منم شادومانم.) ئەو ڕوداوەی کە لەپاش ئەم تەڵقین و دووبارەکردنەوەیە ڕوو دەدات زۆر سەرنجڕاکێشە: لە مێشکی ئێمەدا و لەنێوان ئەوەی کە دەیڵێین و ئەوەی کە کاری پێدەکەین، یاخود لەنێوان ئەوەی کە بیری لێدەکەینەوە و هەستی پێدەکەین، دەبێت هەماهەنگییەك بوونی هەبێت.

ئەگەر ئەمانە (واتە گوتن و کارکردن، یان فیکر و هەست) بەیەکەوە هاوئاواز نەبن. ئەوا دەبێت یەکێکیان بسڕدرێتەوە. بۆ نمونە من بە ئێوە دەڵێم: (من ئێوەم خۆشناوێت)، لەکاتێدا کە بەڕاستی خۆشم دەوێن. هەر ئەوەی کە ئەمەوێت بڵێم ئێوەم خۆشناوێت، یەکسەر مێشکم پێم دەڵێت خۆ تۆ خۆشت دەوێت، ئەم دژبەرییەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕەفتاری من بگۆڕدرێت و ئێوەش دەزانن کە ڕاست ناکەم، چونکە لەناو مێشکمدا هاوئاوازی لەنێوان فیکر و هەست و ڕەفتارمدا بوونی نییە. ئێستە دەڵێم من ئێوەم خۆشدەوێت، مێشکیشم دەڵێت بەڵێ خۆشت دەوێت، دواتر لە ڕەفتارمدا ئەم خوشویستنە نیشان دەدرێت. بەبێ ئەوەی کە هیچ کێشە و ئیستۆپێك بوونی هەبێت.

لە زەینی ئێمەدا دەبێت هەستم لەگەڵ گوفتار و ڕەفتارمدا هاوئاواز بن. خۆ ئەگەر هاوئاواز نەبن ئەوکات من مرۆڤێکی خۆشبەخت نیم. بۆچی دەڵێن درۆکردن خراپە؟ لەبەر ئەوەیە کە درۆ واتە گوتنی شتێك کە لەناوجەرگەی بیرو زەینتدا باوەڕت پێی نییە. هەر ئەم هۆکارەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی لەناو مێشکدا کۆمەڵێك تەڕاییدانەوە ڕوودبات کە لە کۆتاییدا کیمیایی خوێنت دەگۆڕێت و دەبیتە مرۆڤێکی ناخۆشبەخت.

***

بەڵام بابزانین هەموو ئەوەی کە گوتمان چ پەیوەندییەکی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە؟ ئێوە ئەگەر بەردەوام زیکرێك بڵێنەوە

مێشكتان ئاگادار دەبێتەوە كە ئێوە تەسلیم نابن، ئێوە بەردەوام خەریكن ئەم زیكرە دەڵێنەوە. (هەڵبژاردن و پاراستنی ڕەفتارێكی هەڵبژاردنی). هەربۆیە ئەو هەستەی پێشوو كە لەگەڵ ئەم قسەیە یاخود ئەم ڕەفتارەی مندا ناگونجێت، دەیخاتە لاوە و هەستە نوێ دڵخوازەكە دەخاتە جێگەیەوە. دەڵێت: (من شادومانم! من شادومانم! من شادومانم...!) بەڵام مێشكت دەڵێت: (نەخێر تۆ شادومان نیت! نەخێر تۆ شادومان نیت! نەخێر تۆ شادومان نیت!) ئەگەر ئێوە بەردەوام بن لە دووبارەكردنەوەی ڕستە تەڵقینیە ئەرێنیەكەی خۆتان، مێشكتان سەیردەكات كە ئێوە بەهیچ شێوەیەك ئەهلی پاشەكشە نین و هەروەك دەڵێن واز لە مەسەلەكە ناهێنن، لە ئەنجامدا دەڵێت: ( دەی كەوابوو بەدڵنیاییەوە من شادومان) و ناڕەحەتی و بێزاری دەكاتە دەرەوە. (كاتێك خێو دەرچێتە دەرەوە، فریشتە دەردەكەوێت)، یاخود بەگریمان ئەگەر بەردەوام بە خۆتان بڵێن (من سەركەوتوم، من سەركەوتوم، من سەركەوتوم)، مێشكتان دەڵێت: (نەخێر، سەركەوتنم لە كوێدایە؟ بارودۆخی ژیانم بەهیچ شێوەیەك باش نییە، ژیانی هاوسەریەتیم باش نییە، ئیش و كارم باش نییە، خوێندنەكەیشم هیچ باش نییە....) بەڵام ئێوە حەقتان بەسەر ئەم قسانەوە نەبێت، بەڵكو تەنها بڵێن: من سەركەوتوم. بە واتایەكیتر لەمكاتەدا باشتر وایە كە ئێوە بەیارمەتی زەمیری ئاگاتان، بەرنامەڕێژی بۆ زەمیری

ناخودئاگای خۆتان بکەن. کەوابوو ئەگەر بمانەوێت ئەو خالآنەی سەرەوە کۆبەندی بکەین، دەبێت ئاماژە بەم بوارانە بکەین:

١ – ڕستەکان لەسەر شێوەی ڕستەی کورت و ویردەکانیش لەسەر شێوەی دەستەواژەی سادە بهێنرێن.

٢ – بەزمانێکی حالّی زۆر سادەوە باسبکرێن.

٣ – زیکر و دەستەواژەکان دەبێت بەشێوەیەکی ئەرێنی باسبکرێن.

٤ – دووبارە بکەینەوە، تاوەکو دەتوانین دووبارە بکەینەوە، ڕۆژانە سێجار و بەلانی کەمەوە بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ.

ئەگەر ئەمکارە بکەین، ئەوا ڕوداوێکی زۆر باش ڕوودەدات. پێش هەموویان هەست بە شادومانی و خۆشبەختی دەکەین، چونکە ئەوەی کە ئەنجامیدەدەین لەگەڵ ئەوەی کە لەبیر زەینماندایە، یەکێکیە. هەربۆیە دەبینە هەمان ئەو کەسەی کە بانگەشەی دەکەین کە هەین. ئەوکات خەڵکی دەڵێن، ئەمە مرۆڤێکی ڕاستگۆ و خۆشەویست و بەڕێزە. (گەورەترین خەلأت ئەوەیە کە بەوجۆرە بیت کە بانگەشەی بۆ دەکەیت)، (خۆشبەختیە) ئەمەش پاداشتێکی کەم نییە.

## بیرو هۆشێک کە بەکەڵتان دێت

گریمانی ئەوە بکەن کە دەبێت ڕێگەیەکی دوورودرێژ تەیبکەن. ڕێگاکەیش چەندین هەزار کیلۆمەترە، ئێوەش مافی هەڵبژاردنتان هەیە کە بە پێی یاخود بە فڕۆکە بڕۆن. ئێوە کامەیان هەڵدەبژێرن؟ ئەگەر بتوانن ئەوا بەدڵنیاییەوە فڕۆکەکە هەڵدەبژێرن. چونکە خێراتر، دڵنیاتر و تەنانەت تێچویشی کەمترە. ئەگەر ئێوە بتانەوێت بە شەمەندەفەر ماوە دوورودرێژەکان ببڕن، لە کۆتاییدا لە فڕۆکەکە گرانتر لەسەرتان دەکەوێت، هەرچەندە شەمەندەفر یەکێکە لە هۆکارە هەرزانەکانی گواستنەوە. ئێستە من بۆچی ئەم پرسیارە دەکەم؟ هۆکارەکەی ئەوەیە کە یەك هەڵەی گەورە لە پەروەردە و فێرکردنی جیهان و بەتایبەت لە وولاتی ئێمەدا خەریکە ڕوو دەدات، ئەو هەڵەیەش ئەمەیە کە ئێمە کاتێك قسە لەگەڵ منداڵەکانماندا دەکەین و ئەمانەوێت فێریان بکەین، هەمیشە قسەلەگەڵ کراوی ئێمە بەشی (زەمیری ئاگای ئەوانە).

مۆڵەت بدەن زیاتر بابەتەکەتان بۆ ڕونبکەمەوە. قوتابیەکی قوتابخانە کاتێك سەرکەوتوە کە وانەکەی لەبەر بێت و بتوانێت بە

لەبەر بۆ ئێوەی بڵێتەوە. بۆ نمونە بتوانێت بیرکاری حەل بکات و وەڵامی پرسیارەکانی زانست بداتەوە. ئێمە لە قوتابخانەدا وانەکانی وەك بیرکاری و وەرزش و ئەدەبیات و مێژوو جوگرافیاو وانەکانیترمان هەیە و هەمویان دەخوێنین، ئایا کاتێك من بڕوانامەی خوێندنەکەم وەرگرت، بەیانی و دووبەیانی کاتێك هاتمە ناو ژیانەوە، سود و کەڵك لە هەموو ئەمانە وەردەگرم؟ نەخێر! لە شێوازی ئاسایی فێربوندا لەپاش تەنها ٢٤ کاتژمێر لە سەدا ٨٠ بۆ ٨٥ بابەتەکانمان لەبیر دەچنەوە، لەپاش تێپەڕینی ماوەیەکیتریش ئەو لەسەدا ٢٠ دەبێتەوە ٥ لەسەدا. چەندە تێچوی بۆ دەکەین و کاتی بۆ دادەنێین و گەنجەکانمان توش دەکەین، ئەمە تەنها بۆ لەسەدا ٥ فێربون!!

دەبێت بزانین ئەو شتەی پەروەردە و فێرکردن لە قوتابخانەدا کە دواتر سودی بۆ ئێمە هەیە و بەکەڵکمان دێت. بریتیە لە (ماناکان). لەناو ئەم هەموو وانە و فێرکردنانەدا، لە بنەڕەتدا ماناگەلێك شاراونەتەوە، ئەو مانایانەش یارمەتی ئێمە دەدەن بۆ ئەوەی لە ژیاندا سەرکەوتو ببین. بۆ نمونە ئێمە لە قوتابخانەدا فێر دەبین ڕەگی دووەمی ژمارەیەك وەربگرین. فێر دەبین کە بەرزی سێگۆشەیەکی دوولا یەکسان نیوەی پایەیە. فێری ئەوە دەبین کە کامە وولات لە کوێدایە و باشور و باکور چییە. بەڵام دواتر ئەمشتانە چ سودێکیان بۆ ئێمە دەبێت لەژیاندا؟ لەوانەیە هەر خودی بابەتەکان بەکەڵکی ئێمە نەیەن. بەڵام ئەو ماناو چەمکانەی کە بۆ

ئێمە دەمێننەوە، ئەو ئاڵۆزیانەی کە مێشکی ئێمە بەهۆی خوێندنەوەی ئەم بابەتانەوە پەیدای دەکات، ئێمە بەتواناتر دەکات. کاتێك ئێمە توانیمان ٢ زەربی ٢ بکەین یاخود کۆکردنەوە و لێدەرکردن و دابەشکردن بکەین، ئەوە لە ڕاستیدا فێری حەل کردنی مەسەلەکە بوین. ئەم مانایانە لە ژیاندا یارمەتی ئێمە دەدەن، دەبێت ئەوەشمان لەبیر بێت: ئەوکاتەی کە ئێمە لە پەروەردە و فێرکردندا سەرکەوتوین کە (ماناکان) بەباشی جێگەی خۆیان بگرن. چونکە ماناکان بەهیچ شێوەیەك لەبیری مرۆڤ ناچنەوە. مانا باشەکان دید و قوڵی مەیدان و تێڕوانینی فراوان دەبەخشن. ئێمە والێدەکەن کە بتوانین بڕیار بدەین، مرۆڤێکی باشتر لە ئێمە دروستدەکەن، باشە ئێوە داستان و بەسەرهاتی مرۆڤە گەورەکان بۆچی دەخوێنن؟ بۆ ئەوەی کە لە کۆتاییدا ئەم مانایە لە بیرو زەینی ئێمەدا جێگیر ببێت کە دروستکاری و چاکە باشترە. ئەم مانایە لە بیرو زەینی ئێمەدا جێگیر ببێت کە ڕاستگۆیی باشترە. کەوابوو ئەگەر ئامانج ئەمەیە، ئەوا ئەو ڕێگەیەی کە پێیدا دەچین ڕێگەیەکی زۆر باش نییە. چونکە کاتێك تاقیکردنەوەی منداڵەکانمان دەکەین، ئەوە تاقیکردنەوەی ئەو شتانەیان دەکەین کە لەبەریان کردوون، ئەوە هەڵدەسەنگێنین کە چەندە لەناو (زەمیری ئاگایدا) ماوەتەوە. تاقیکردنەوەکانی ئێمە، زۆر بەکەمی تاقیکردنەوەی مانایین، کە بمانەوێت بزانین ئایا منداڵەکە لە ناوەڕۆکی بابەتەکە تێگەیشتوە یان نا؟ هەرکاتێك کە مامۆستایان و فێرکاران، چ لە قوتابخانە و چ لە

زانکۆدا، ماناکان لە قوتابیان و خوێندکاران بپرسنەوە، دەبینین منداڵەکان و قوتابیانی زانکۆیش توشی کێشە دەبنەوە و هەروەك گوتمان شتەکانیان لەبیر نەماوە..!!

***

لەدەوروبەری دەیەی هەشتای زایندا و نزیکی ٣٠ ساڵ لەمەوبەر، یەکێك لە زانایانی ئەمریکایی دەستیکردە خوێندنەوە بۆ ژیانی کەسانێکی سەرکەوتوی وەك بەڕێوەبەرە درەوشاوە و پیشکەوتوو سەرکەوتوەکان. ناوبراو خاڵێکی زۆر سەرنجڕاکێشی بۆ دەرکەوت. ئەم زانایە ئەوەی بینی کە تەنها پارامترێك کە ئێمە بۆ هەڵسەنگاندنی منداڵەکانمان بەکاری دەهێنین، بریتیە لە (ئای کیو) یاخود هەمان (بەهرەی بیرو هۆشیە)، کە ئامارێکی زۆر سەیری بەدەستهێنا. بینی زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئای کیویەکی بەرزیان هەیە، کاروپیشەی باشیان نییە، کەسانێکی داهێنەر و بەڕێوەبەر و پێشەنگ نین و لە پێگەیەکی باشدا نین، ئەم هەموو هەوڵ و کۆششەی ئێمە لەسەر ئای کیو کە کاری لەسەر دەکەین بۆ ئەوەی پشکی بیرو هۆشی منداڵەکانمان بەرز ببێتەوە! بەڵام بەپێچەوانەوە ئەم زانایە گەڕا و مرۆڤانێکی سەرکەوتوی دۆزییەوە و لێکۆڵینەوەی لەبارەیانەوە کرد و تێگەیشت کە مرۆڤە سەرکەوتوەکانی جیهان، چ لە ئابوری و چ لەسیاسەت و هونەر و...هتد، خاوەنی بەهرەیەکیترن بەناوی (ئی کیو) یان (بیرو هۆشی هەیەجانی) ئەو کەسانەی کە بیرو هۆشێکی بەرزی هەیەجانیان هەیە، سەرکەوتو ترن، ئەمە

لەکاتێکدایە کە ئێمە لە پەروەردە و فێرکردنماندا، تەنها خەریکین کار لەسەر ئای کیو (بەهرەی بیرو هۆشی) دەکەین.

***

چۆن دەتوانین کەسانی پێشڕەوو خەڵکانێکی زۆر سەرکەوتو دروستبکەین؟ مەگەر شانسمان هەبێت و لەخانەوادەی ئەو منداڵەدا، دایکوباوك یاخود پەروەردەکارانێك پەیدا ببن کە نرخ بۆ بیرو هۆشی هەیەجانی ئەو منداڵە دابنێن. زۆرێك لەو کەسانەی کە هۆشی هەیەجانیان نییە، دەسڕێنەوە. خودی خۆم لەو کۆمپانیایانەی کە دەچم بۆ ئەوەی وانە بڵێمەوە، یەکێك لە گەورەترینی ئەو مەسەلانەی کە لەبەرامبەر خۆمەوە دەیبینم، هەر ئەمەیە. هەموان چاوەڕێی ئەوە لەمن دەکەن کە سیستەمی کادیربەندی کراو لەگەڵ پاوەر پۆینت(پرۆگرامی بەناوبانگی مایکرۆسۆفت بۆ بەرهەمهێنان و نمایشی خستنەڕوو) دروستبکەم و چوار ووشەی دیاریکراوی تێدا بنوسم. ئەیانوەوێت لەبەریان بکەن. ئەمە لەکاتێکدا کە پێیاندەڵێم تکاتان لێدەکەم ئیسراحەت بن و دابنیشن. ئەوە (ئەرکی منە) کە بابەتەکان بە ئێوە بگەیەنم، ئێوە تەنها بەشداری لەم یارییەدا بکەن! ڕێگەبدەن کە هەیەجانتان بێتە جۆش و خرۆش! هەروەك منداڵەکان پێبکەنن و یاری و هاروهاجی بکەن! لەوێدا کە خەریکن فێر دەبن و (بابەتەکان) دەگۆڕدرێن بە (مانا) ئەگەر چی لەوانەیە ووشەگەلێکتان پێگوترابێت کە دواتر بیرتان نەیەنەوە. بەڵام دڵنیابن کە ماناکەیان لەناختاندا چەسپیوە. ئەمە چۆن؟ مۆڵەت بدەن بۆ

ئەوەی داستانێکتان بۆ بگێڕمەوە. بەڕێزێك دەیگێڕایەوە کە هێشتا من بانگهێشتی ڕێکخراوی فێرکاری ئێوە نەکرابوم، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لێپرسراوی پێشوازیکردن بووم، هاتم و لە سوچێکدا بێدەنگ بۆ خۆم دانیشتم و گوێم بۆ ووتارەکەتان گرت. هاتم بزانم دەنگوباس چییە. دەبینم زۆر جیاوازە و ئەو قسانەی کە لەو دانیشتنەدا دەکران، مانایەکی نوێیان سەبارەت بەژیان بە من بەخشی. ئەم بەڕێزە دەیگوت من نە مەلزەمەم بەدەستەوە بوو نە کاغەز و وەرەقەیشم پێبوو کە شتەکان یاداشت بکەم، بەڵام هەفتەیەك دواتر کاتێك لە فەرمانگەیەکدا کارێکم هەبوو، کارمەندێکی بێتاقەتم بینی، کە هەموو موراجیع و هاوڵاتیەکانی بێزار دەکرد. کاتێك هاتە سەرەی من، تورە بووم. پێشتر نەریتم وابوو لەبەر ئەوەی کە هێزی بازوو دەسەلاتم هەیە، بەرامبەرەکەم بەرز دەکردەوە فرێم دەدایە کەنارێکەوە! بەڵام ئەمجارەیان لەگەڵ ئەوەی کە چومە پێشەوە بۆ ئەوەی ئەوکارە بکەم، کتوپڕ ڕستەیەك لە دەمم هاتە دەرەوە و گوتم: (ئەم مێزەی تۆ چەندە جوانە!) بەڕاستی خۆیشم سەرم لەم قسەیەی خۆم سوڕما. ئەویش پێکەنی و سوپاسی کردم و گوتی: کارت چییە؟ دواتر هەموو کارەکانی بۆ ئەنجامدام. منیش بەسەرسوڕمانەوە لەبەر خۆمەوە گوتم: باشە ئەوە چی ڕوویدا؟ باشە من چیم لەگەڵ ئەودا کرد؟ ئەم بەڕێزە دەیگوت فێرکارییەکانی تۆ کاریگەری کردبویە سەرم و ئیتر بەدەستی خۆم نەبوو. تەنها هێندە بەس بوو کە بزوێنەرێك بێتە پێشەوە و منیش

کاردانەوە گونجاوەکەی نیشانبدەم. ئەوەش تەنها بەبەشداریکرن لەیەك دانیشتنی ڕێکخراوی فێرکاریدا. بۆچی؟ چونکە ئەم مرۆڤە بە حەزوئارەزووەوە بەشداری کردبوو. چونکە ڕێگەی دابوو کە فێرکارییەکە لەناو بوون و وجودیدا جێگیر ببێت.

ئازیزانی من! پسپۆڕان چوارجۆر بیرو هۆشیان لە مرۆڤدا دۆزیوەتەوە:

**یەکەم:** بیرو هۆشی جەستەیی. جەستەی ئێمە ئارەق دەکات ، دەڕشێینەوە. چاومان ڕیپۆق دەکات. گوێمان چڵك دەکات. لەوانەیە سکچون یان لەرز و....هتد بگرین. هەموو ئەم شتانە بەهۆی هۆشمەندی میکانیزم و سازوکاری جەستەمانەوەیە، جەستەیەك کە هۆشمەندترە، بەدڵنیاییەوە تەندروستتریشە. واتە تاکە تاکەی خانەکانی جەستەی ئێمە خاوەنی هۆشیارین و خۆیان پزیشکی خۆیانن. زۆربەی نەخۆشەکان پێش دەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشیەکانیان چارەسەریان دەکەن. کەوابوو ئەمە هەمان ئەو بیرو هۆشە جەستەییەیە.

**دووەم:** بیروهۆشی لێکدەرەوە. هەر ئەوەی کە زۆر بەناوبانگە و دەبێت بەهۆیەوە بتوانیت ژمارە و شتە جیاوازەکان لەبەر بکەیت، حافیزەی دوورونزیکەکانت ئیش بکەن، کۆمەڵێك تێستیش بۆ هەڵسەنگاندنیان بونی هەیە.

**سێیەم:** بریتیە لە بیرو هۆشی هەیەجانی، ئەمەیان کە من و تۆی مرۆڤ لەیەکتری جیا دەکاتەوە. توانای ئەوەمان پێدەدات کە دەرك

بکەین و سەرنج بدەینە هەستی خۆمان و خەڵکانیتریش. دەتوانین بە هەیەجانمان بیربکەینەوە و کاریش بکەین. نەوەك ئەوەی کە بە هەیەجانیەوە کار بکەین و بجوڵێینەوە.

**چوارەم:** بریتیە لە بیرو هۆشی مەعنەوی. ئەو کەسانەی کە دەرکێکی قوڵتریان لەبارەی خۆیان و دوونیاوە هەیە، خۆناسی دەکەن، چاوەڕوانیان لە خۆیان لە دوونیا شتێکی فروانترە و تەنها یەك سەرکەوتنی سادە ئەوان ڕازی ناکات، لە خۆیان دەپرسن کە (بۆچی هاتومەتە دونیاوە و بۆ کوێ دەچم و چی دەکەم، ئایا سودێکم هەیە؟)

سیستەمی فێرکاری ئێمە بۆ دروستکردنی وولاّتێکی باشتر و سەرکەوتوتر، دەبێت هەوڵبدات سەرنج بداتە هەرچوار لایەنەکەی بیرو هۆش، نەك تەنها گرنگی بەیەکێکیان بدات. تەنها ئەوەمان لە منداڵەکانمان نەوێت کە وەك توتی شتەکان لەبەر بکەن و لەکاتی تاقیکردنەوەدا نمرە بەدەستبهێنن و هەرکەسێك نمرەی زیاتر بهێنێت، پلەی یەکەم بێت. نەخێر! ئەم لاپەڕەی کاغەزە، ووشەکانی من موبەمو لە ئێوە باشتر و وردتر تۆمار دەکات. بەلاّم ئەوە ئێوەن کە باشترین بەهرەو سود وەردەگرن، چونکە ئێوە هۆشی هەیەجانیتان هەیە. بەلاّم ئەم لاپەڕە کاغەزە ئەوەی نییە. ئەوە ئێوەن کە دەتوانن سود لەم بابەتانە وەربگرن. چونکە ئێوە ئەمانە پەیوەست دەکەن بەیەکەوە. ڕابوردو مێژوو پێشینەکان دەزانن. مانایەکی زۆر دەدەن بەم قسانە. هەرچەندە بە ئەندازەی ئەم لاپەڕە

کاغەزە لە قسەکانی من لە بیرو زەینتاندا نەمێنێت کە چیم گوتوە. دەستبخەینە ناو دەستی یەکتر و چاوەکانمان بشۆین و بەجۆرێکیتر سەیربکەین و بە کۆمەڵێک بڕیاری سادە بەڵام بنەڕەتی، کۆمەڵێک گۆڕانکاری ئەنجامبدەین کە خێرا و ئاسان و خۆشبن و بگۆڕدرێین و ئاوەدان ببینەوە. ئەی ئەو کەسەی کە ئێرانت خۆش دەوێت کارێك بکە.....

## شوڵی ئالوبالو

لەبیرمە کاتێك منداڵ بووم دەچوم بۆ قوتابخانە، لەسەردەمی ئێمەدا نەریت وابوو ئەو منداڵانەی کە بێ ئەدەب بوون، یاخود کارێکی دروستیان ئەنجام نەدەدا، یاخود بە دەستەواژەی ئەمڕۆی من (لەچوارچێوە و قاڵبی خۆیان دەردەچون) تەمبێ دەکران. بەداخەوە یەکێك لە تەمبێکان فەلاقەکردن بوو، کە خودی خۆیشم یەکجار فەلاقە کرام. لەبیرمە لە پۆلدا مامۆستاکەمان منداڵێکی بێتاوان و داماوی هێنا و گوتی تۆ دەبێت بەیانی دارکاری بکرێیت، لەمکاتەدا کە خەریکبوو شەرحی دەکرد کە ئەم منداڵە دەبێت دارکاری بکرێت و شوڵ بخوات (لەوانەش بوو کە زۆر بەجیدی نەبوبێت) منداڵەکانی ناو پۆلەکە یەکە یەکە دەستیان بەرز دەکردەوە و کێبەڕکێیان دەکرد کە کامیان شوڵ و دارەکە بهێنن! شوڵ بهێنن کە چی ببێت؟ بۆ ئەوەی هاوپۆلەکەیان تەمبێ بکەن؟ بۆ نمونە دەیانگوت ئەو دارەی کە ئێمە دەیهێنین، ئەگەر شوڵی ئالوبالۆ بێت زۆر باشترە. منیش لە خۆمم دەپرسی ئەمە یانی چی؟ ئەمە هاوپۆلی ئێمەیە و ئێمەش لەبەرامبەرییەوە وەستاوین و چاومان بڕیوەتە یەکتری، خۆ ساڵی داهاتو مامۆستاکەمان دەگۆڕدرێت. بەڵام

ئێمە بەلایەنی کەمەوە تاوەکو شەش مانگ ئەم منداڵە هاوڕێیەمان دەبینین، لەو سەردەمەدا ئەقڵم ڕێگەی ئەوەی نەدەدام لەوە تێبگەم بۆچی کێبەڕکێ دەکەم بۆ ئەوەی هاوپۆلەکەم لێدان بخوات. باشە بۆچی من کۆمەڵێك کارئاسانی دەکەم بۆ ئەوەی ئەو زیاتر ئازار بکێشێت؟ بۆچی ئاسانکاری دەکەم کە ئەو زیاتر سوکایەتی پێبکرێت؟ ئەو ئێستە پێویستی بە خۆشەویستی و سەرنجدان و نێوەندگیری هەیە. دەبێت بچینە پێشەوە و بڵێین لێی ببورن، ئەمجارە کاری لەو شێوەیە ناکات. نەوەك ئەوەی کە کێبەڕکێمان بێت بۆ ئەوەی لێی بدرێت و زیاتر ئازاری ئەو بدەین.

ئێستە کە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمە خەمناکە و سەیر دەکەم، وادەزانم کە لەوانەیە منداڵەکان لەبەر ترسیان بوبێت کە ئەمکارەیان دەکرد، بۆ ئەوەی لەلای مامۆستا خۆیان ببەنە پێشەوە، بۆ ئەوەی دواتر لێدان نەخۆن. بەڵام بەچ نرخێك؟ بەنرخ و بەهای پلیشانەوەی هاوپۆلەکەیان. هەروەك گلادیاتۆرەکان کە دەبێت یەکتری بکوژن تاوەکو قەیسەر خۆشحاڵ ببێت. ئەمە سیستەمێکی خەمناکە. بەڵام ئێستە خۆشبەختانە لەناو قوتابخانەکاندا، لەبەر گەشەی ڕۆشنبیری و ئاگایی خەڵکی و ئاگایی بواری فێرکاری مامۆستایان، قوتابیان دارکاری ناکرێن و شوڵیان لێنادرێت. بەڵام ئێستە دارکاری و شوڵکاریگەلێك هەن کە دەرد و ئازارەکەیان کەمتر نیە لە شوڵی ئاڵوباڵو. ئازارەکەی کەمتر نیە لە شوڵی تەڕی ئاڵوباڵو، ئەویش بریتیە لە (سوکایەتیپێکردن) و (بەراورد کردن). واتە

کێبەرکێ ناتەندروستەکان. من دەچم خراپەی هاوکارو هاوپۆلەکەم دەڵێم. بۆچی؟ بۆ ئەوەی کە جێگەی خۆم لە دڵی مامۆستا یان بەڕێوەبەر یاخود هاوسەرەکەمدا بکەمەوە. کە چی ببێت؟ بۆ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان تەمبێ نەکرێم. خۆ ئەمە ژیان نییە. عەشق نییە. ئێمە بۆ ئەمکارە نەئافرێنراوین. باشە بۆچی دەبێت ڕێگە بە بوونی سیستەمێکی لەمشێوەیە بدەین، کە مانەوەی من لە وردوخاش بوون و سوکایەتیپێکردنی هاوڕێ ئازیزەکەمدا بێت؟ کەسێك کە هەمیشە چاومان پێی دەکەوێت. باشە بۆچی هاوجۆرەکانمان، هاونیشتیمانیەکانمان، جۆری مرۆڤ دەبێت ئازار بچێژێت؟ ئەمەوێت تکاتان لێبکەم، کە بۆساتێك بێدەنگ بن و سەیرکەن و بزانن دار و شوڵ بۆ کوێ دەبەن، کوێی ئەو شوڵە تەڕ دەکەن و دەیبڕن. بۆ ساتێك بیر بکەنەوە و بزانن چ کەسانێك دارو شوڵی تەڕیان بۆ ئێوە هێناوە و داویانە بە مامۆستا یاخود بەڕێوەبەرەکەتان؟ چ حاڵێکتان بۆ دروستبووە؟ کەمێك بیر بکەنەوە.

زۆر بەئازارە. چ خۆمان بکەوێنە بەر هێرشەوە و چ ببینە هۆکار بۆ ئەوەی هێرش بکرێتە سەر خۆشەویستانمان و تەنانەت گیانەوەران و سروشتیش. بۆچی؟ دەبێت پرسیار لە خۆمان بکەین. نابێت بێ گوێپێدان بەسەر شتەکاندا تێپەڕین. ئەگەر خۆشبەخت نین، ئەگەر دەبینین هەموو سیستەمەکەمان هاوسەنگ نییە، دڵنیابن هۆکارێکی هەیە. هۆکارەکەیشی لە جۆری تێڕوانینی ئێمەدایە. لە جۆری بیرکردنەوەی ئێمە و لە و مامەڵە و ڕەفتارانەدایە کە هەمانە.

من و ئێوە کاریگەرین. چ مامۆستا بین و چ قوتابیەك بین کە تەمبێ دەکرێت و چ ئەو قوتابیە بین کە دارو شوڵ بۆ مامۆستا دەهێنێت، وەیاخود قوتابیەك کە وەستاوە و خەم دەخوات و سەرگەردانە کە دەبێت چی بکات. زۆرێك لەمکارانە دەکەین. زۆر زیاتر لەوەی کە بیری لێدەکەینەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی بەشێکە لە ڕۆتینیاتی ژیانمان، پێمانوایە کە نەخێر، من شتێکی لەمشێوەیە شك نابەم.

بەڵام هەواڵێکی لەمەش خراپتر، حەزم دەکرد ئەم هەواڵەتان پێنەدەم، بەڵام ناچارم. چونکە ئەگەر نەیڵێم ئەوا زیانەکانی خراپتر دەبن. ئەو هەواڵە خراپترەش ئەمەیە کە مامۆستایەکی تورە و بێ بەزەییە. قوتابیەکیش هەیە دەبێت تەمبێ بکرێت، قوتابیەکیش هەیە کە ئەیەوێت چڵە ئاڵوباڵوی تەڕ بهێنێت و قوتابیەکیشتریش هەیە کە سەیر دەکات. هەموو ئەم کەسایەتیانە لەناو دەرونی تاکە تاکەی من و ئێوەدان. خۆت بەیانی تاوەکو ئێوارە بە شێوەیەکی بێ بەزەییانە تەمبێی خۆت دەکەیت. هەر خۆت خراپترین هۆکار و کەرەستەکانی ئەشکەنجە و ئازار بۆ خۆت فەراهەم دەکەیت. لەلایەکەوە دڵت دەسوتێت، بەزەییت دەجوڵێت و دەتەوێت خۆت ڕزگار بکەیت. لەلایەکیتریشەوە مامۆستایەکی تورە و لەوانەیشە کەمێك ڕێزم هەیە نەفام. بڕیاریداوە کە تۆ تەمبێ بکات. بۆچی وەك فلانەکەس نیت، بۆچی ئەم هەلومەرجانەت فەراهەم نەکردووە. بۆچی بێ غیرەتی، بۆچی سەرکەوتو نیت، بۆچی سەعیت نەکردووە،

بۆچی ناتوانیت لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بگەیتە لێکتێگەیشتن و...هتد و هەمیشە خەریکی دار و شوڵ لە خۆت دەدەیت.

خۆت مامۆستایت، خۆت قوتابیت، خۆت دارو شوڵ دەهێنیت، هەر خۆیشت سەیر دەکەیت. ئەو شتەیش کە خەریکە لەناو دەچێت، هەر خۆتی. با بێن و چاوەکانمان بشۆین و بەجۆرێکیتر سەیر بکەین و بڕوانین. با لەگەڵ خۆماندا میهرەبان بین. ئەو مامۆستا تورە و بێ بەزەییە لەگەڵ خۆیدا بێ بەزەیی بوو کە لەگەڵ منداڵە قوتابییەکاندا بێ بەزەیگەری دەکرد. چونکە لەسەردەمی منداڵیدا سوکایەتی پێکرابوو، هەر بۆیە لەکاتی گەورەییدا ئەمیسش سوکایەتی بە خەڵکانیتر دەکرد. دەستێکی خۆشەویست نەهێنراوە بەسەریدا کە ئەمیش دەستی خۆشەویستی و بەزەیی بهێنێت بەسەری خەڵکانیتردا. ئێمە ئێستە تێدەگەین، لەبەر ئەوەی کە دەزانین لێپرسراوین. با بێین و بەیارمەتی یەکتری بچین بەدەم یەکترەوە و یەکتر ڕزگار بکەین. با بێین و بچین بۆ ڕزگارکردنی جۆری مرۆڤ. کە یەکێك لەو مرۆڤانە خودی خۆتی، هاوسەرو منداڵەکانتانن. با بێین و یارمەتی خۆمان بدەین. با بێین و چاوەکانمان بەباشی بشۆین، با بێین و شتانێکی نوێ فێر ببین. کتێبی جۆراوجۆر بخوێنینەوە. با لەم ڕۆتینیاتە بچینە دەرەوە. ئەم ڕۆتینە دەرئەنجامەکەی هەر ئەمەیە کە ئێمەی تێداین. ئەگەر باشە، ئەوا لەسەری بەردەوام بن و ئەگەریش خراپە، دەی تکایە بوەستن و هەراو هۆریا مەنێنەوە. ئەوەندە شەڕو ئاژاوە لەگەڵ خۆتاندا مەکەن و خۆتان سزا مەدەن.

بابزانین چۆن لەگەڵ خۆتاندا خراپن؟ لەوانەیە جگەرە بکێشیت یاخو مادە هۆشبەرەکان بەکار بهێنیت. کەمخەوی، نەچیت بۆلای پزیشك. دەرمانەکانت نەخۆیت، ئەو خواردنەی کە بۆت باش نییە بیخۆیت و ئەوەی کە بۆت باشە نەیخۆیت. لەوانەیە سەیری ئەو بەرنامەیە بکەیت کە بۆت باش نییە و سەیری ئەو بەرنامەیە نەکەیت کە بۆت باشە. ئەو کتێبەی کە بەسودە بۆت نەیخوێنیتەوە و ئەوەی کە سودی نییە بیخوێنیتەوە. هاوڕێکانت هەڵنەبژێریت. ڕێز بۆخۆت دانەنێیت. منداڵ و هاوسەرەکەت ئازار بدەیت(ئیتر چ پیاو بێت یان ژن). میهرەبان نەبیت. نەڵێیت کە ئاگاتان لەمن بێت. دەبێت بڵێیت (من پێمخۆشە کە ئاگاتان لە من بێت، خوشکان برایان چەند خولەکێك مۆڵەت بە من بدەن. ئەمەوێت نوکتەتان بۆ بگێڕمەوە. من پێویستم بەوە هەیە کە سەرنجتان بدەنە من و ئاگاتان لەمن بێت). مەڵێن ئەمە چ گرنگیەکی هەیە؟ چونکە گرنگیەکی زۆری هەیە. من پێویستم بەوە هەیە کە ئێوە سەرنج بدەن و سود لەم بابەتە وەربگرن. ئەگەر سەرنج نەدەن و سود و کەڵك وەرنەگرن، ئەوکات کاری من بێهودە دەبێت. دەبێت بخوێنمەوە، بەڵگەی نمونەیی بدۆزمەوە، کارێك بکەم کە بابەتەکەم سەرنجڕاکێش و گۆیا بێت، تاوەکو ئێوە کات لە خوێندنەوەی ئەم بابەتەدا سەرف بکەن، چێژ وەربگرن، ببنە خەڵکانێکی باشتر و بەسودتر کاریگەرتر، بۆ خۆتان، خێزان و خانەوادەتان، شارەکەتان، دونیا، سروشت و گیانەوەران. بەکورتی بە کەڵکی هەمووان بێن و سودتان بۆ هەموو لایەك هەبێت.

***

بەڵام کاتێك ئێمە لێدان واز لێدەهێنین، کاتێك تەمبێ کردن و سوکایەتی پێکردنی خەڵکانیتر واز لێدەهێنین، کە لەگەڵ خۆماندا ئاشت ببینەوە. کاتێك ئافەرینی خەڵکی دەکەین و بەچاکە باسیان دەکەین و چێژ لە سەرکەوتنیان دەبەین، کاتێك بە خۆشحاڵی خەڵکانیتر خۆشحاڵین و بە خەموپەژارەیان خەمبار دەبین کە لەگەڵ خۆماندا ئاشت ببینەوە و خۆمان خۆش بوێت، ڕەقمان لە خۆمان نەبێت، کاتێکیش ڕقمان لە خۆمان نەبێت، ئەوکات ڕقمان لە سروشت و خەڵکانیتریش نابێتەوە.

***

ئەمکارە زۆر سادەیە و ئەنجامیش دەدرێت. یەکەمین هەنگاویشی ئەوەیە کە بوەستن و ئەمکارانە نەکەن کە ئەنجامتان داون و کردوتانە. ئەمە خۆی بۆخۆی سەرکەوتنێکی گەورەیە. کاتێك هاوسەرەکەمان خواردنێك دروستدەکات، پێویستە سوپاسی بکەین. ئەگەر سوێر بوبێت، ئەوەش خۆی بۆ خۆی خواردنێکە! بڵێن: (خانمەکەم ئەم خواردنەی ئەمشەو وەك خۆت زۆر بەتامە!) ئەو خۆی دەزانێت کە سوێر بووە و گوتنی ناوێت. نەیتوانیوە خواردن دروستبکات؟ هیچ کێشەیەك نییە، دەچینە دەرەوە نان دەخۆین. ئێمە لەچواردەوری یەکیتری کۆبوینەتەوەو دەبێت چێژ وەربگرین. نابێت شتەکان لەسەر یەکتری بە قورس بگرین، کاتێك مەسەلەکان بەقورسی ناگرین کە لەگەڵ خۆماندا ئاشتەواییمان کردبێت و

شتەکان لەسەر خۆیشت بە قورس نەگریت. کاتێك لەگەڵ خەڵکیدا میهرەبانیت کە لەگەڵ خۆتدا میهرەبان بیت. هەر بەم سادەییە و بەم جوانییە و بەم کاریگەرییە!

## ژێرخانی ئابوری، بریتیە لە متمانە

باوکم دیگێڕایەوە کاتێك من لە بەشی قەرزبوم و لە بانکی نیشتەجێبونی ئێستا، -کە ئەوکات (بانکی ئیجارە) بوو- کارم دەکرد، هەندێکات کە خەڵکانێك دەهاتن بۆ ئەوەی قەرز وەربگرن. زۆر پێویستیان پیلا هەبوو. خانویەکیان کڕیبو، قیستێکیان لەسەر بوو، هیچیان بەدەستەوە نەمابوو. هەندێکات لەبەر ڕەچاوی یاسا نەماندەتوانی یارمەتی ئەم کەسانە بدەین، یاخود بەدڵی خۆیان قەرزیان پێبدەین. هەندێك لەم کەسانە شپرزە دەبون، توڕە دەبون و سوکایەتیان پێدەکردین و تۆمەتیان دەداینەپاڵ. تۆمەتی ناڕەوایان دەدایە پاڵمان و منیش زۆر هێمن و لەسەر خۆو خوێنساردانە مامەڵەم لەگەڵدا دەکردن. هەندێك لە هاوکارەکانمان دەیانگوت دەبێت لیژنەی لەسەر بگرین، چونکە ئەم کەسە سوکایەتی کردووە و دەبێت سزا بدرێت. سوکایەتی بە فەرمانبەری دەوڵەت کردووە و لەمجۆرە قسانە. منیش بێدەنگبوم، هەندێك دەیانگوت تۆ گوێ نادەیت. هەندێکیتریش دەیانگوت بێ غیرەت و ترسنۆکیت. هەندێکیتر دەیانگوت گێلۆکەیت. قسانێکی زۆریان دەکرد. هەندێکیتریش دەیانپرسی تۆ بۆچی ئەوەندە بێدەنگیت!

باوکیشم لەوەڵامدا دەیگوت: ئێمە ئیشمان چییە؟ ئەرکی ئەم فەرمانگەی ئێمە چییە؟ ئێمە بۆچی لێرەدا دانیشتوین؟ موچە وەردەگرین بۆ ئەوەی یارمەتی ئەم خەڵکە بدەین. هەندێکات ناتوانین یارمەتی بدەین. ئەو بێتاقەت دەبێت و شتێك دەڵێت. هاوکارەکانم دەیانگوت تۆ بێ غیرەتیت کە ڕێگە دەدەیت هەرچییەك بیانەوێت پێتانی بڵێن و ڕوویان قایم ببێت. باوکیشم لە قسەکانی خۆی بەردەوام دەبوو دەیگوت خۆشەویستانی من، ئێمە لێرەدا دەرمانخانەیەکمان هەیە کە خەڵکانی بە ئێش و ئازار دێن بۆئێرە و پسوڵەکانیان دەهێنن بۆ لای ئێمە. هەندێکجار ئێمەش دەرمانی جێگەی مەبەستی ئەوانمان نییە. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە هیچی نییە و ئازار دەچێژێت، لەبەر ئەوەی کە ئێمە دەرمانەکەی ئەومان لەلا نییە، زۆر بێزار و بێتاقەت دەبێت. ئەگەر ئێمە ناتوانین یارمەتی بدەین، خۆ نابێت دەرد و ئازارێکیتر بۆ ئازارەکانی زیاد بکەین. ئێمە لێرەدا دانەمەزراوین کە بۆ خەڵکی لیژنە و لیژنەکاری بگرین، تەنها لەبەر ئەوەی کە لەکاتی دەوامی ئاساییدا فلأنەکەس سوکایەتی بە فەرمانبەری دوڵەت کردووە. ئەمە کاری ئێمە نییە. کاری ئێمە ئەوەیە کە کاری ئەوان بەڕێبخەین، ئەگەر ناتوانین ئەمە بکەین، با داوای لێبوردن بکەین. لەوانەیە هەلێك بێتە پێشەوە یاخود یاساکان بگۆڕدرێن و بتوانین خزمەتیان بکەین.

***

ئەم شێوازی بیرکردنەوە و کردارەی باوکی من، کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر ژیانی ئێمە. ئێمە شتانێکی زۆر فێر بوین. دواتر کاتێك من بوومە خاوەنی کۆمپانیا و ئیش و کارو کەسابەتێکم بۆ خۆم پێکەوەنا، هەندێکات بۆ نمونە کارمەندەکانی ژمێریاری یاخود هاوبەشەکان ئاماژەیان دەکرد بەوەی کە با نهێنیکاری بکەین و لە باج خۆمان بدزینەوە. یاخود کاڵایەك هاوردە بکەین و بە نیوەی نرخ رایبگەیەنین بۆ ئەوەی گومرگێکی کەمتر بدەین، منیش بەم ئازیزانەی خۆمم گوت ئێمە کۆمپانیامان دروستنەکردوە کە فێڵ لە دەوڵەت بکەین و بیخەڵەتێنین. بەڵکو کاری ئێمە قازانجکردنە لەرێگەی دابینکردنی خواست و داواکارییەکانی کڕیاران و پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییە بەنرخەکانە کە ئەوان لەبەرامبەریدا پارە بدەن. کەوابوو دەبێت پارەی گومرگەکەیشی حیساب بکەین. ئەگەر من بمەوێت کێبەرکێیەکی فێڵبازانە بکەم و ئەم و ئەو بخەڵەتێنم، ئەوکات کاتێك بەدەر لە ئاراستەی ئەرکی فەرمانگەکەمدا سەرف دەکرێت و بەفیڕۆ دەچێت.

***

زۆربەی کاتەکان ئێمە ناگەین بە ئاوات و ئامانجەکانمان. لەبەر ئەوەیە کە شتی ناسەرەکی و لاوەکیمان خستوتە پێشی شتە سەرەکییەکانەوە. ئاگامان لە خۆمان نەبووە کە لەخۆمان بپرسین ئایا ڕۆڵ و ئەرکی من لەناو ئەو خێزان و ئەم کۆمپانیایەدا چییە؟ باشە بۆچی ناوی من لە لیستی موچەی ئم فەرمانگەدایە؟ چ کارێك

دەکەم؟ چ سود و قازانجێك بەدی دەهێنم، کە لەبەرامبەریدا پارەم پێدەدەن؟ چۆن دەتوانم ئەم بەهایانە ئاشکراتر بکەم بۆ ئەوەی موچەو حەقدەستێکی زیاترم پێبدەن؟ ئەگەر فەرمانبەری کڕینم، بە دروستکاری، بە خستنەڕوی کالاّ و شمەکی باشتر، (نەوەك ئەوەی کە فرۆشیار بێتاقەت بکەم، بەڵکو دەبێت ئەویش بەهەمان شێوەی فەرمانگە و ڕێکخراوەکەی من قازانجی لێبکات) فرۆشیار ڕازی بکەم کە متمانەی چەند مانگەمان پێبدات و لەکاتی خۆیدا پارەکەی بدەین، بەمشێوەیە فەرمانگە و ڕێکخراوو وولاّتەکەم و (لە ئەنجامیشدا خۆم) سەرکەوتر دەبین. چونکە منی فەرمانبەری کڕین لەوە تێگەیشتوم کە لەم ڕێکخراوو فەرمانگەیەدا ئیش و کارم چییە. ئەڵبەتە بەڕێوەبردن و نەخشە و پلانی ڕێکخراوو فەرمانگەش یارمەتی ئەم ئەرکە گرنگە دەدات.

***

خاتونی ماڵەوە، ئایا ئەرکی ئێوە لە ماڵەوە چییە؟ ئەگەر من ئەرکی خۆم بدۆزمەوە و بەرەو ئاراستەی بڕۆم، هەم ژیانم باشتر دەبێت و هەم خۆیشم خۆشحاڵ ترم. ئەگەر من ئەمەوێت کە گرنگ بم، خۆم دەربخەم و چواردەورەکانم من بناسن، دەتوانم ئەمکارە بە خراپەیشەوە ئەنجامبدەم و هەمیش بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری ئەم چاکەیە بەدەستبهێنم. دەتوانم هەڵبژێرم، بەلاّم بەمەرجێك بزانم بۆچی لێرەدام. ئەو کۆمپانیا و کۆمپانیایانەی کە من هەمە، یاخود لەناویاندا ئیش و کار دەکەم، چ ئەرکێکیان هەیە؟

ئەرکی کۆمپانیایەك ئەمەیە کە قازانج بکات. لە بنەڕەوەتەوە و نیەت و مەبەستی نوسینگەیەکی ئابوری، بریتیە لە قازانجکردن. بەڵام لە چ ڕێگەیەکەوە؟ ئەگەر من کۆمپانیایەکم دامەزراند کە هاوردە دەکات یاخود خزمەتگوزاری ئەنجامدەدات، یاخود بەرهەمێك دروستدەکات، ئایا ڕێگەپێدراوم کە مادەی هۆشبەر بفرۆشم؟ یان ئایا ڕێگەم پێدراوە نایاسایی بجوڵێمەوە و کاڵاو شتومەکی قەدەغە و ڕێگەپێنەدراو بفرۆشم؟ ئەگەر ئەمەوێت ئەمکارە بکەم، ئەوا لە ئەرکی ڕێکخراوەکە دەرچوم. واتە قازانج بە تەنهایی بریتی نییە لە ئەنگێزە و هۆکار. قازانج لە ڕێگەی پێناسە گومرگیەکانەوە ڕاست و دروستە. لە یاسای بنەڕەتی ئێمەدا نوسراوە کە ڕێگەمان پێدەدرێت چ کارانێك ئەنجامبدەین. دەبێت ئەوکارانە بکەین. ئەگەر پێویستە بیگۆڕین، بڕۆین و ووزەکانمان بگۆڕین، یاخود فێرییان بکەین. کاری کۆمپانیایەك ئەمە نییە کە فێڵی دارایی بکات یاخود دەگە لە گومرك بدات! ئەڵبەتە بەپێی یاسا ئێمە دەتوانین بڕۆین و سود لە پێناسگەلێکی گومرگی وەربگرین کە کەمترین گومرگی هەیە. هەم یاساییە و هەمیش بە سودی ئێمە و کڕیارەکانیشمانە. دەتوانین پارێزەر بگرین و بەشێوەیەکی یاسایی لەگەڵ داراییدا بجەنگین. چ کێشەیەکی تێدایە؟ نەك ئەوەی کە باج و گومرگ نەدەین و لەژێربارییدا دەربچین. ئەمە پارەی ئێمە نییە. وەك ئەوە وایە کە موشتەری بێت و پارەکەی لەناو کۆمپانیادا بەجێبهێڵێت و ئێمەش وەك بەشێك لە داهاتی خۆمان حیسابی بکەین.

***

ئازیزێکمان هەیە کە خەریکبوین بەیەکەوە قسەمان دەکرد. گلەیی لە بارودۆخەکان هەبوو. گلەییەکەی بۆ ئێوە باسدەکەم، ئێمە دەتوانین ئەم گلەیی و مەسەلەیە چارەسەر بکەین، بەومەرجەی کە لە ئێش و ئازارەکە تێبگەین. ئەم بەڕێزە دەیگوت ئەو شتەی کە من بێزار و بێتاقەت دەکات ئەمەیە کە لە سادەترین کڕینێك کە من ئەمەوێت بیکەم، لە نانێکەوە بیگرە، تاوەکو چەند ملیارێك موڵك یان زەوی، هەمیشە بیر لەوە دەکەمەوە کە نەکا بمخەڵەتێنن. ئەم قسەیە زۆر بە ئازارە. منی هاوڵاتی بەردەوام دەبێت ئاگادار بم کە کەسێك نەمخەڵەتێنێت. ئەمە نەریتێکی زۆر خراپە. چونکە ئابوری لەناو متمانە بەخۆبوندا گەشە دەکات. بنەماکانی گەشەی ئابوری بریتیە لە (ئیعتیبار)، نەك (پارەی نەخت). ئێوە دەتوانن بە یەك نەقدینگی سنوردار لە ناو سیستەمی ئیعتیباری دروستدا، بۆ نمونە بە ۱۰۰۰ تمەن بایی ۱۰۰۰۰تمەن شتومەك و کاڵا بکڕن. دەتوانن بە ۱۰ هەزار تمەن بایی ۵۰ هەزار تمەن شتومەك بکڕن. بەومەرجەی کە لەکاتی خۆیدا پارەکەی بگێڕنەوە، واتە ئێمە ئابوریمان وەڕێخست و بایی ۷۲۰ هەزار تمەن سوڕی ئیشمان بەدیهێنا، بەڵام تەنها بە ۱۰ هەزار تمەن. کاتێك متمانە لەناو بچێت چی ڕودەدات؟ بۆ ۷۲۰ هەزار تمەن کارو کەسابەت دەبێت ۷۲۰ هەزار تمەن بخەینە کارەوە، بەمشێوەیە دەگە لە ئابوری ووڵاتەکەم دەدەم. با بێین و باش بیرکردنەوە و باش ڕەفتارکردن و ڕاستگۆیی بە یەکێك لە بەها

بالآکان بزانین. هەندێك وادەزانن زیرەکن. چ زیرەکیەك؟ ئەگەر من ئێوە بخەڵەتێنم و ئەم کارەی منیش ببێتە نەریت، ئەوکات ئێوە دڵەڕاوکێتان هەیە و هەر زۆر کە بتانەوێت دروستکار بن، بەردەوام دەبێت ئاگاتان لە خۆتان بێت بۆ ئەوەی کەسێك نەتان خەڵەتێنێت، بەمشێوەیە ووزە و تواناتان بەرەو ئاراستە و لایەك دەچێت کە نابێت لەوبوارەدا سەرف بکرێت. بیزنسێك کە دەتوانرێت بە تەلەفۆنێك یاخود بە داواکردنێکی نوسراو ئەنجامبدرێت. گرنتیەکی زۆری پێویستە. بەمشێوەیە هەموو فرۆش و سوڕە ئابوریی و بەرهەمهێنانیەکان کەم دەبنەوە. ئەمەش تەنها لەبەر نەبونی متمانە و ئیعتیبار.

***

با بێین و لە خۆمانەوە دەستپێبکەین. ئەو کەسەی کە ئیش لەگەڵ من و ئێوەدا دەکات، ئەگەر بزانێت ئێمە دروستکارین، نرخەکانمان نرخانێکی جێگیر و نەگۆڕن و نامانەوێت فروفێڵ بکەین. نامانەوێت زیادە بسەنین و ناشمانەوێت زیانمان پێبگات و زەرەر بکەین. باوەڕبکەن لەو شوێنانەی کە ئێوە نرخێکی جێگیر و مەعقولتان هەبێت، خەڵکی زوتر متمانەتان پێدەکەن، تاوەکو ئەو کاتەی کە خەڵکی چەلەحانێ لەسەر نرخی ١٠ هەزار تمەن بکەن و بیگەیەنن بە ٣٠٠٠ هەزار تمەن. بە ڕواڵەت ٧٠٠٠ هەزار تمەن قازانجی کردووە، بەلآم هێشتا هەر لە دڵی خۆیدا دەڵێت خۆزگایە دیسانەوە چەلەحانێم بکردایە. خۆ ئەگەر بە خۆڕاییش شتەکەی پێبدەین، ئەوا

دەڵێت لەوانەیە شتێکی تێدا بێت کە بە خۆڕایی ئەم شتەی دا بەمن. ئێمە دەتوانین بە ڕەفتارەکانمان، سیستەمی کۆمەڵگەمان بگۆڕین. ئێمە کاریگەرین. ئێمە کەسانێکی بەتواناین. ئەگەرچی لە چوارچێوەی ئیختیاری خۆشماندا بێت. بەلایەنی کەمەوە دەتوانین لە ماڵی خۆماندا دەغەڵی و نالەباری بە بەها نەدەینە قەڵەم. لە هیچ شوێنێکی دوونیا و لە هیچ نەریت و ئاینێکدا نادروستی بەها نییە، بەڵکو کارێکی دژە بەهایە. خەڵەتاندن و درۆکردن بەها نییە، پێچەوانەکەی دروستە. با کارێك بکەین کاتێك کە شتێك دەکڕن، بە متمانەوە بیکڕن. هەروەك کاسبە کۆنەکان، -کە ئەڵبەتە هێشتا هاوشێوەیان هەر ماوە- کە ترازوەکانیان بە سودی کڕیارەکە قورستر دەکرد. پارەکەی وەردەگرت و لە کڕیارەکەی دەپرسی ڕازیت؟ یەکترییان ماچ دەکرد و مامەڵەیان دەکرد. من عەرزی ئێوە دەکەم، من کە لە دەرەوەی وولات دەژیم، بنەڕەتی ئیش و کار لەسەر متمانە و ئیعتیبار وەستاوە. کاتێك ئێوە داواکارییەکی نوسراو لە کڕیارەکەتانەوە وەردەگرن کە دەڵێت فلانە کالای دەوێت، ئێوەش کالاکەی بۆ دەنێرن و لەسەر بنەمای ئەو بڕیارنامەیەی کە لەنێوان ئێوە و کڕیارەکەدا هەیە، ٣٠ بۆ ٤٥ ڕۆژ دواتر پارەکەی وەردەگرن. هەر ئێستە ئەگەر من بمەوێت کالایەك بکڕم، لە زۆرێك شوێندا ناتوانم کالا بکڕم، مەگەر ئەوەی کە لەگەڵ فرۆشیارەکەدا حیساب و کیتابم هەبێت، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی کە بۆ وەرگرتن و پێدان، دەبێت ئیعتیبارێکم لەلای ئەوان هەبێت. تاوەکو ئاستی ئەو

متمانە و ئیعتیبارەی کە هەمە بەبێ هیچ کێشەیەک دەتوانم کاڵاو و شتومەکیان لێوەربگرم و بەردەوامیش بۆم دەنێرن و یەک مانگیش کاتم هەیە کە پارەکەیان بۆ بنێرم. ئەگەر پارەیەکی نەختینە بدەیت، ئەوا پێت نافرۆشن، چونکە سیستەمێکی لەوشێوەیان نییە، خۆیان گوتەنی دەبێت ئەکاونتیان لەگەڵدا بکەینەوە. ئابورییە گەورەکان لەسەر بنەمای ئیعتیبار و ڕێزگرتن لەبەرژەوەندی یەکتری هەڵدەسوڕێن، هەندێك لە ئێمە وابیردەکەینەوە کە سود و قازانجی ئێمە لە زیانگەیاندن و خەڵەتاندن و سوکایەتیکردندایە بە یەکتری. ئەمە یاری براوە- دۆڕاوەیە. دەبێت یەکێك بدۆڕێت تاوەکو من خۆشحاڵ ببم. شتێکی لەمشێوەیە نییە. چونکە هەم دەبێت ئێوە قازانج بکەن و هەم منیش دەبێت سود و قازانجم پێبگات. هەم ئێوە خۆشحاڵ بن و هەمیش من. بەمشێوەیە گەشە دەکەین. من و ئێوە دەتوانین ئەم گۆڕانکارەییە بەدی بهێنین. هەوڵبدەین هەر لە ئێستەوە لە هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوسەر، منداڵ، هاوکار، کارمەند، کاسبی گەڕەکەکەمان و موشتەری و کڕیارەکەماندا ڕاستگۆ و دروستکار بین. لەوانەیە قورس بێت و خەڵکی درەنگ باوەڕ بکەن. چونکە لە زۆربەی کاتەکاندا، پێچەوانەی ئەمە بوونی هەبووە. بەڵام هەر بەوجۆرەی کە وردە وردە گەیشتوە بەم ئاستە خراپە، دەتوانرێت دووبارە بگەڕێتەوە بۆ سەر پردی متمانە و ئیعتیبار.

***

کارێك بکەین کە ژینگەی دەوروبەرمان ژینگەیەکی دەستاودەستکردن و سوڕی ئیش و کار بێت. کاتمان لە گەشەسەندندا سەرف ببێت، نەك پاراستن و سنورردارکردن و بچووککردنەوە و شەڕکردن. هەر بەوجۆرە بێت کە باوباپیرانمان بەیەکەوە کاروکەسابەتیان دەکرد. لە بەشی دواتردا ئەوە ڕوندەکەینەوە کە پیاوێکی یابانی ئیفلاسی کردبوو، کاتێك لەپاش چەند ساڵێك بازرگانە ئێرانیەکە دەبینێت کە پێشتر کاری لەگەڵدا دەکرد، ئەوپارەی دایەوە بە بازرگانە ئێرانیەکە کە لەلای خۆی هەڵیگرتبوو. دڵنیابن کاری جوان هەمیشە جوان و پایەدارە و هەرگیز نامرێت.

## هەڵە بۆ کەسی هەڵەکار دەگەڕێتەوە

لە کەنەدا کۆمپانیایەکم هەبوو. ڕۆژێکیان بەیەکێك لە هاوکارەکانم گوت: ئێمە ئێستە ئەوەندە کەموکوڕیمان هەیە. هەربۆیە دەبێت ئەندازە و ڕێژەی فرشتنمان بەرز بکەینەوە، یاخود سود لە ئیعتیبارەکانمان وەربگرین. بە بڕوای تۆ چی بکەین باشە؟ ئەویش کە گەنجێك بوو. گوتی: زۆر سادەیە. چەکێکی پێبدەن.

منیش گوتم: باشە خۆ ئێمە پارەیەکمان لە حیساب بانکیدا نییە. ئیتر چۆن چەك بدەین؟

گوتی: لێرە چەك زۆر گرنگ نییە. تەلەفۆن دەکەین بۆ بانك کە سەرفی نەکەن و ٢٠ دۆلاریش غەرامە دەدەین.

منیش گوتم: ئازیزەکەم تۆ دەڵێیت چەکێك بدەین کە بێ ئیعتیبارە؟!

گوتی: تاوەکو ئەو کەسە بڕوات و بیەوێت پارەکەی وەربگرێت ئێمە کات دەکرین.

گوتم: ئەی باشە بۆچی کاڵامان پێدەدەن؟ لەبەر ئەوەیە کە ئیعتیبار و متمانەمان هەیە. کاتێك ئیعتیبارمان هەیە کاڵامان

پێدەدەن. ئەگەر بەدەستی خۆم ئەم ئیعتیبارە خراپ بکەم، ئەی باشە بۆ جاری داهاتو چی بکەم؟

گوتی: تاوەکو ئەوکاتە هەر شتێکی لێدەکەین.

منیش گوتم: نەخێر براکەم ئەوە ناکەین. متمانەی من سەبارەت بەو کەسە گەنجە کەم بویەوە. ئەو بەبڕوای خۆی ئەیویست یارمەتی من بدات و چاوەڕێ بوو کە سوپاسی بکەم. دواتر ناوبراو لەلای ئێمە ڕۆیشت، بویە خاوەنی کۆمپانیایەك، کۆتا هەواڵ و دەنگوباس کە سەبارەت بەو کەسە هەمە ئەوەیە کە ئیفلاسی کردووە و لەوانەیشە ڕایکردبێت. ئەم کەسە بەمنی دەگوت کە پارە و کارتی متمانەکەتان مەدەن. ناتوانن هیچ شتێکتان بەرامبەر بکەن، منیش بەناوبراوم گوت کە من بەهیچ شێوەیەك هەقم بەسەر ئەم شتانەوە نییە کە کەس بەدوامدا دەگەڕێت یان نا. دەکەومە بەر بەدواداچونی یاساوە یان نا. نەخێر، کێشەکە شتێکیترە. کێشەکە ئەوەیە کە ئەگەر ئەوکارە بکەم، ئەوا بە شێوازێکی فیکرییەوە چومەتە ناو ئەمکارەوە کە کۆتاییەکی باشی نابێت. ئەوکەسەی کە بەم شێوازە بیرکردنەوەیە دەچێتە ناو ئەمکارەوە، ئەوا هەموو ووزە و توانای لە پەردەپۆشکردن و تەڵەکەبازیدا خەرج دەکات. هەربۆیە دەبێت بیرکردنەوەمان ڕاست و دروست و باش بێت.

***

بەسەرهاتێك لە خەیاڵمدایە، پێمخۆشە ئێوەش بیخوێننەوە. یەکێك لە هاوڕێکانم ئەم چیرۆك و بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە. یەکێك

لە بازرگانە کۆنەکانی ئێران کە ئێستا کۆچی دوایی کردووە. ئیشی لەگەڵ پیاوێکی یابانیدا دەکرد. لەم سەودا و مامەڵانەی کە ئەنجامیاندەدا، بەردەوام بەیەکەوە حیساب و کیتابیان هەبوو. ئەندازێك لە پارەی بازرگانە ئێرانیەکە لە حیسابی بانکی کابرای یابانیدا دەمایەوە، کاتێك ئەم دەچو بۆ یابان، ئەوانیش پارەکەیان دەدایەوە بەم بازرگانە. دەگێڕنەوە ئەو کەسەی کە لەیاباندا بووە، ئیفلاس دەکات. ئەم بازرگانە بەڕێزە ئێرانیەش، دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك منیش چوم بۆ یابان، بڕیارمدا سەردانێکی ئەم هاوڕێ بازرگانە کۆنە یابانیەی خۆم کە بارودۆخێکی باشی نەبوو، بکەم. دۆزیمەوە و دەبینم کە پیرە پیاوو پیرەژنێکن و لەناو ئاپارتمانێکی بچوکدا بەیەکەوە دەژین. چوم بۆلایان و گوتم تۆ بەردەوام پەیجۆری ئەوە بویت کە من ببینیت، ئەگەر تاوەکو ئێستە نەهاتوم بۆلات، تەنها هۆکارەکەی ئەوەبوو کە حەزم نەدەکرد جەنابتان لەم بارودۆخەدا ببینم. پیرە پیاوە بازرگانەکەش گوتی زۆر بێتاقەت دەبوم کە نەدەهاتیت بۆ لام، من ئیشم بە تۆ هەیە، پێشوازییەکی سادەیان لێکردین و زەرفێکیان هێناو دایان بە من. منیش پرسیم ئەمە چییە؟ پیرە پیاوەکەش گوتی: ئەمە ئەو قەرزەی تۆیە کە لەلای من بوو. بازرگانی ئێرانیش بە سەرسوڕمانەوە گوتی: خۆ ئێمە حیساب و کیتابێکمان بەیەکەوە نییە، پیرە پیاوەکەش گوتی: بەڵێ هەمانە، من قەرزداری تۆم. کاتێك زەرفەکەی کردەوە، دەبینێت بڕێکی پارەی زۆرە کە دەگاتە نزیکەی ١٠٠ هەزار دۆلار. بازرگانی

ئێرانیش پرسی ئەم پارەیە چییە؟ پیرە پیاوی یابانیەکەش گوتی: ئەمە قەرزی تۆیە لەو مامەڵانەی کە هەمانبووە. کابرای ئێرانیش گوتی: ئاخر بارودۆخی تۆ بەشێوەیەکە کە من حەزدەکەم یارمەتیتان بدەم و ئەم پارە بۆ خۆت بێت. پیرە پیاوەکەش گوتی: نەخێر، من خێر وەناگرم. ئەم پارەیە هی تۆیە. بازرگانە ئێرانیەکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك ئەم پیرەپیاوو پیرەژنە یابانیەم بەجێهێشت، و لەناو شەمەندەفەرەکەدا دانیشتبوم سەیری ئەو پارەیەم دەکرد، بەباشی تێنەدەگەیشتم. مرۆڤێك ئیفلاس دەکات و تێکدەشکێت. منیش ئاگام لێی نییە. هیچم پێنەدەگوتراو هیچ بانگەشەیەکم نەبوو. بەلاّ ئەم پیاوە ساڵانێکی زۆر بوو کە هەواڵی بۆ دەناردم بۆ ئەوەی بمبینێت، منیش وامدەزانی ئەیەوێت داوای قەرزم لێبکات. ئەم بازرگانە ئێرانیەش پیاوێکی شەریف و ناووناوبانگ جوان بوو.

***

خۆزگایە ئەو گەنجەی ئێمە کە ناوم لێناوە (هامون)، لەلام بوایە و ئەم چیرۆکەم بۆ بگێڕایەوە.

مزرع سبز فلك دیم و داس مه نو

یادم از کشته خویش امد هنگام درو

ئێمە لە کۆتاییدا ئەوە دروێنە دەکەینەوە کە چاندومانە. گرنگ نییە خەڵکی چۆن بیر دەکەنەوە، یان تێدەگەن یاخود تێناگەن. تۆوی هەڵە بچێنن، بەدڵنیاییەوە بەرو میوەی هەڵەتان

دەستدەکەوێتەوە. کاری هەڵە هەڵەیە. ئیتر چ مرۆڤەکان تێبگەن و چ تێنەگەن. کاتێك من کارێکی هەڵەم کرد، ئەوکات تێکەڵی هەڵە دەبم. دەبێت لەبیرمان بێت کە ئێمە بە ڕەفتار و هەست و شێوازی بیرکردنەوەمان ئایندەی خۆمان دروستدەکەین. مەگەر دەکرێت من بە بیرۆکە و فیکرێکی هەڵە شتێك دروستبکەم و ڕاستی بکەمەوە و دەرئەنجامێکی باش وەربگرمەوە؟ شتی بەو شێوەیە نابێت. ئێوە هیچ قاچاخچیەکتان بینیوە کە بە خۆشبەختی و شادومانیەوە بژی؟ هیچ خراپەکار و نالەبارێکتان بینیوە بەبێ ئەوەی کە تەنانەت پۆلیسیش بە دوایەوە بێت، خۆشبەخت بێت و دڵی ئارام بێت؟ هەرگیز شتی لەو جۆرە نابێت و زۆر مەحاڵە.

پۆلیسێك لە کەنەدا بە منداڵانی گوتبو، سەیری فیلمەکان بکەن و بزانن کامە لەم خراپەکار و نالەبارانە کۆتاییەکی باشیان هەبووە. زۆربەیان لە تەمەنێکی مامناوەنددا دەمرن، یاخود توشی کێشانی مادە هۆشبەرەکان دەبنەوە، خراپی و ڕزینی کاروبارەکان دەیانکوژێت. ئێوە هەرگیز خراپەکارێك نابینن کە تەمەنێکی زۆری هەبێت و بە سەربەرزییەوە ژیابێت، مەگەر ئاراوتەیەکمان هەبێت. گشتگیرییەك بۆ ئەمکارە بوونی نییە. زۆرێك لە شتەکان بە قەدبڕ دێنەبەرچاو. من ئەگەر ئەمکارە بکەم ئەوا زوو دەگەم بە سود و قازانج و ئەمجۆرە قسانە. ئەوەتان لەبیر بێت کە سەرکەوتن بەرهەمی دروستکاری و بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروستە. ناکرێت لە ڕێگەی هەڵەوە سەرکەوتو ببین. چونکە کارەکانمان

لەگەڵماندا دێن. کاردانەوەو ئاوێنەنوێنی کارەکانمان هەمیشە بەدوامانەوەیە. ئەمانە ڕێسای ژیانن. ئەو کەسانەی کە لەخۆیان بێ هیوان، بە هەڵەدا دەچن. ئەو کەسانەی کە دەرئەنجامی خێرایان دەوێت، بە هەڵەدا دەچن. من کە پیاوێکم، کاتێك تانە و تەشەرێك لە هاوسەر، منداڵ، یاخود کارمەندەکەی خۆم دەدەم، بۆ ئەوەی گوێڕایەڵ بن، بەبڕوای خۆم سەرکەوتو بووم. بەڵام بەهیچ شێوەیەك وانییە. برینی ئەم تەشەرە لەسەر دڵ و دەرونی ئەوان دەمێنێتەوە. من دەریچەی عەشقم بەسەرخۆمدا داخست و خۆشەویستی ڕاستگۆیانەم دەستناکەوێت. هەرچیەك هەیە، هەر سەرۆکایەتی بێت و بەس. کاتێك لەمن بترسن، ئەوکات منیان خۆشناوێت. لەبەر ترس و لەرزیانە کە لەگەڵمدا هەڵدەکەن، من پێموایە کاروبارەکانم بەرەو پێشەوە دەچن. ئەمە لەکاتێکدایە کە کاروبارەکانم بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە و بەردەوام پاشەکشە دەکەن!

دەبێت عاشق بن و خۆشیان بوێیت و لە دڵەوە خزمەتی تۆ بکەن، ئەمەش کارێکی ئاسان نییە. دەبێت کات دابنێیت و حەوسەڵە و مەتانەتت هەبێت. بەڵام باوەڕ بکەن وەك دارگوێزێك وایە. لەوانەیە ٤ بۆ ٥ ساڵ بخایەنێت تاوەکو بەر بگرێت، بەڵام کاتێك هاتە بەرهەم، ئەوا ساڵ لەدوای ساڵ بەرەکەی زیاتر و زیاتر دەبێت، باشترین دارو سێبەرەکانیشتان پێدەبەخشێت و لەگەڵ کەمئاویشدا هەڵدەکات. ئەو سەرف دەکات و ئێمەش دەبێت بۆ درەختی باش سەرف بکەین. ئەو لۆبیایەی کە ئێوە دەیچێنن، نابێتە درەخت. تەمەنی تەنها یەك

وەرزە و دواتر تەواو دەبێت. خۆڕاگر نییە. کاروبارە بنەڕەتیەکان وەك داری گوێزن، کاتی دەوێت، پێکهاتە و حەوسەڵە و بەهێزی و نەلەخشاوی دەوێت. بەڵام کاتێك هاتە بەرهەم، بەباشی دێتە بەرهەم.

***

وەرن با لەم تەمەنە کورت و کاتیەدا کە هەمانە، کات بەفیڕۆ نەدەین. کاروبارە بنەڕەتی و ڕاست و دروستەکان ئەنجامبدەین. جیاوازی مرۆڤە خراپەکار و بزێوەکان لەگەڵ مرۆڤە سەرکەوتو چاکەکارەکان، لەوەدایە کە دەتوانن دەرئەنجامی درێژمەودا و ئاوێنەنوێنی ئاکار و ڕەفتارەکانی خۆیان ببینن. با بگەڕێینەوە و ئەگەر کارانێکی کورت مەودا دەکەین و دەرئەنجامی کورت مەودایشمان دەوێت، با کەمێك قوڵببینەوە. من نمونە و شاهێدی نمونەگەلێکی فراوان لە دەوروبەری خۆمدا دەبینم، لەو کەسانەی کە کورت بیرییان کردوەتەوە و دەرئەنجامی کاتییان ویستوە، ناسکی و نازدارییان نواندووە، فشارییان هێناوە و هەڕەشەیان کردووە، ئێستەیش کەسانێکی ناخۆشبەختن. هەروەها نمونەی ئەو کەسانەشم لەلایە کە مرۆڤانێکی دروستکار بون و حەوسەڵەیان هەبووە و لەو بەشەی پێشو لەپێشترن. ئەمە لەکاتێکدایە کە گروپی یەکەم خۆیان بە کەسانێکی زۆر هۆشیارتر و زیرەکتر دەزانی لە گروپی دووەم، هەر بەڕاستی هۆشیارتر و زیرەکتریش بوون! بەڵام دروستکار و ڕاستگۆ نەبوون. ئەوەت دەستدەکەوێتەوە کە چاندوتە.

تۆوی باش بچێنە. حەوسەڵە و تاقەت هەبێت. کەسێکی مەتین و نەلەخشاو بە. چونکە هیچ ساختەچییەك نابێتە کەسێکی دەوڵەمەند. هیچ بیرکورتێکیش سەرکەوتو نابێت. هیچ مرۆڤێکی ستەمکاریش خۆشبەخت نابێت، ئەگەر زۆرترین ستەم و زۆردارییەکانیشی هەبێت. با بێین و چاوەکانمان بەباشی بشۆین و بچین و بەهاکان بدۆزینەوە، رێزبگرین و نیگا و سەیرکردنێکی دورمەودامان هەبێت.

***

کەمێك قەناعەت بکەن و حەوسەڵە بەخەرج بدەن. نەتانەوێت لە ماوەی یەك شەودا رێگەیەکی ١٠٠ ساڵە ببڕن. بڕۆن و سیستەمە سەرکەوتوکانی ووڵاتانیتر و کارو کەسابەتە سەرکەوتوەکانیان ببینن. هەموو ئەوانە رەگ وڕیشە و قەدێکی بەهێزیان هەیە و هەر ئەم قوڵیەیە کە بووەتە هۆی سەرکەوتنیان. ئێمە بەیارمەتی یەکتری دەتوانین، خانەوادەیەکی بەهێز و قوڵ و بەرێز، رێکخراوو شار و ووڵاتێکی دروستکار دروستبکەین. کارێك بکەین کە منداڵەکانمان لە ئاکار و رەفتارمانەوە بزانن داهاتوو عاقیبەتی هەموو کارێك دەبینینەوە. ئەوەش کاتێکە کە مرۆڤ بزێوو نالەبار نەبێت. چونکە هەموو کەسێکی خراپەکار و بزێو ئەگەر بیتوانیایە چارەنوسی کارەکانی خۆی ببینێت، هەرگیز هەڵە و خراپەی نەدەکرد.

## خاڵێکی گرنگ لە فڕۆکەخانەیەی سەیرو سەمەرەدا

بەهۆی جۆری ژیان و کارەکەمەوە، گەشت و سەفەری زۆر دەکەم. لە یەکێك لەم گەشتانەدا، دەبوایە لەیەکێك لە فڕۆکەخانەکاندا بۆماوەی چەند کاتژمێرێك بمێنمەوە و چاوەڕێ بکەم، بۆ ئەوەی فریای فڕینی دواتر بکەوم و بەرەو کەنەدا بگەڕێمەوە. بۆ ئەوەی کە ماندویەتیم دەربچێت، چوم بۆ توالیت بۆ ئەوەی ئاوێك بە دەموچاومدا بکەم و کەمێك سەروفەسالْم ڕێکوپێك بکەم. کاتێك چومە ناو توالیتەکەوە، دەبینم زۆر پاکو خاوێنە، بریقەی دەدایەوە، بۆنێکی خۆشی لێوە دێت! دواتر سەیری بەردەرگاکەم کرد، دەبینم بە دیوارەکەوە خشتەیەك هەیە کە تێیدا بەرنامەی پاکوخاوێنی توالیتەکەی تێدا نوسراوە. بینیم کە چەندە بە وەسواسیەوە ئەم شوێنە بە پاکوخاوێنی ڕاگیراوە. مرۆڤ هەر حەز دەکات بچێتە ناوییەوە، جلوبەرگەکانی هەڵبواسێت و دەست و دەموچاوی خۆی بشوات، دەبینم تەنانەت دووشەکانیشیان کردوەتەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێك بیەوێت بچێت و خۆی بشوات، بە ئاسانی بتوانێت ئەوکارە ئەنجامبدات.

***

خاڵێکی گرنگ: لەناو دەفری توالیتەکاندا، شتانێکی هاوشێوەی مێشیان لکاندبوو پێیانەوە، کە لە مێشی سروشتیش دەچون. ئەم کارە ناسك و جوانەیانم زۆر پێخۆش بوو. ئەمانە وێنەی مێشیان لەوێدا دانابوو بۆ ئەوەی خەڵکی بیریان نەچێتەوە سەردەمێك لێرەدا مێش و مەگەز هەبووە، بەڵام ئێستە نەماون. بەلایەنی کەمەوە لەناو توالیتەکەیاندا نییە. دەستخۆشیم لێکردن و ئافەرینم کردن. ئەمانە خەڵکانێکی بە ئیمانن. چونکە (پاکوخاوێنی بەشێکە لە ئیمان و باوەڕ).

***

کەمێکی خایاند و لەپاش شۆردنی دەموچاوم، جانتاکەم هەڵگرت و چوم بۆ ڕیستورانتی فرۆکەخانە بۆ ئەوەی شتێك بخۆم. هەروا کە دانیشتبوم و خواردنەکەم تەواو بوبو، پێشکارێکی ڕەش پێست کە خاتونێکی تەمەن مامناوەند بوو، هاتە پێشەوە بۆ ئەوەی قاپەکان کۆبکاتەوە. منیش سوپاسم کرد و گوتم: (زۆر سوپاس). خەندەیەکی کرد و ڕۆیشت. لەپاش چەند ساتێك گەڕایەوە و پەرداخێك ئاوی بۆ هێنام! سەرم سوڕما. گوتم زۆر سوپاست دەکەم. خۆ من داوای ئاوم نەکردبوو. بە چاوی ئاماژەی بۆ کلێنسی سەر مێزەکە کرد. چەند حەبێکم هەبوو کە دەبوو بیانخۆم، لەسەر کلێنسێك دامنابون بۆ ئەوەی بیانخۆم و ئەم ژنەیش بینیبوی. ئەم حاڵەتە کاریگەری کردە سەرم. ئافەرینی ئەویش و بەڕێوەبەریەتی

ئەو فرۆکەخانەیەشم کرد. چۆن دەکرێت کاریگەریەکی لەبیرنەکراو بکاتە سەر من و بتوانم ئەم ڕووداوە بگوازمەوە بۆ دەیان هەزار کەس؟ ئێوەش بیگێڕنەوە بۆ هاوڕێکانتان، ئەم کاریگەرییەش شتێکی بێکۆتایی دەبێت. چەندە وردبونەوە؟ خۆ کەس ئەوی ناچار نەکردبوو. منیش هیچ بەخشیشێکم پێنەدابوو. ئەو کارەکەی خۆی خۆشدەوێت. هەرکە کەسێك سوپاسی دەکات، حەزدەکاتە بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەو چاکەیەی بداتەوە. هەریەکەو بە جۆرێك. هێشتایش دەموچاوی دەمبەخەندە و متمانەبەخۆبونەکەیم لەبەرچاوە. زۆر سوپاسم کرد و حەبەکانم خوارد و پەرداخەکەم گێڕایەوە.

***

لە خەیاڵدا بووم، بیرم لەوە دەکردەوە کە چ بەڕێوەبەرایەتیەکی پایەدار و بەهێزیان هەیە، کە ئەم سیستەمە بەڕێوە دەبەن. چەندە ئەو کەسانەیان بەلاوە گرنگە کە دێن بۆ ئێرە. چ تێگەیشتنێکیان لەم شوێنە هەبێت و دەبێت خوێندنەوەی موشتەرییەکانیان بۆ ئەم شوێنە چۆن بێت. دەزانن ئەگەر ئیمان و باوەڕ لەناخی کەسێکدا سەبارەت بە شتێك بێتە ئاراوە، ئەوە شتێکی پایەدارە و بەهیچ شتێك ناکرێت بکرڕدرێت. لە ناو بیرو خەیاڵی ئەم فیکرانەدابوم کە کتوپڕ دەنگێك لە گروپێکەوە هاتەبەرگوێم کە گۆرانیان دەگوت.

***

ئاوڕمدایەوە و سەیرم کرد. دەبینم ئۆرکێسترایەکی بچوکە و چەند کەسێك جلوبەرگی تایبەتیان پۆشیوە و خەریکن گۆرانیەکانی ساڵی تازە دەچڕن. ئەوەندە جوان و هەماهەنگ گۆرانیەکانیان دەگوت و ئەوەندە شاد و خۆشحاڵ بون کە توشی شۆکێکی ئەرێنی تر بوم. لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە کە ئەم خاتون و کاکەیەی کە گۆرانیەکە دەڵێن، زۆر پیشەگەر و هونەرمەندن. ئەمانە بە زەوق و شەوقەوە دێن و لەناو ئەم فرۆکەخانەیەدا گۆرانی دەڵێن. کارەکەی خۆیان خۆشدەوێت. خەریکی کارێکن بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە دێنە ناو ئەم فرۆکەخانەیەوە، چێژ وەربگرن و هەمیشە حەزیان لەوە بێت لەم هێڵەوە گەشتەکانیان ئەنجامبدەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم وولاتە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئاوەدانتر و دەوڵەمەندتر ببێت.

***

زۆر چێژم وەرگرت. چەندە بە یەکەوە هاوئاهەنگ بوون. من گەشتیارێك بوم و لەو ساتەدا سەیری ئەوانم دەکرد، بەدڵنیاییەوە سەری هەموو سەعاتێك ئەوکارەیان دووبارە دەکردەوە. باشە دەبێت بەڕێوەبەرایەتی ئەم فرۆکەخانەیە چۆن بیری کردبێتەوە؟ کە ئێرە بۆ کۆنسێرت شیاوترە؟ یان ئێرە هۆڵی مۆسیقایە؟ نەخێر! ئایە بەشێکی ئەمە بەشێکە لە شەرحی ئەرکەکانیان کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بەوشێوە زۆر جوانە موسیقا بژەنن؟ نەخێر! ئایا ئەو شوێنە نمایشخانە و ناوەندی سەرگەرمی بوو؟ نەخێر! بەڵام کارەکەی خۆی خۆشدەوێت. ئەگەر داهێنانکارییەکیش

بەخەرج بدات، ئافەرینی دەكرێت. ئەرك و لێپرسراویەتی قبوڵ كردووە. بۆ ئەو گرنگە ئەو كەسانەی كە لەوێوە تێدەپەڕن، شاد و دڵخۆش بن. بەلایەوە گرنگە كە یادگارییەكی خۆش لەپاش خۆی بەجێبهێڵێت. لە توالیتەكەیەوە، لە ڕەفتاری و خزمەتكارو پێشكارەكەیەوە. ئەو سەرگەرمییە ئامادەكراوە بۆ گەشتیارەكان. ئەمانە كارانێكن تێچویەكی زۆریان ناوێت. ئەمانە بریتین لە بیركردنەوەو ئایدە و بیرۆكەیەكی جوان. كاتێك من كارێك قبوڵ دەكەم، دەبێت هەوڵبدەم كە تێیدا كاریگەر و بەسود بم و ئامانج و نیەت و مەبەستم ئەمە بێت ئەو كەسانەی كە سەردانم دەكەن، خۆشحاڵ بن و بە ئارامیەوە گەشتەكەیان بكەن و بیرەوەرییەكی خۆشیان هەبێت و كاتێكیان هەبێت و بتوانن لەو سیستەمە چێژ وەربگرن. ئێمەش دەتوانین. پێویست ناكات من و ئێوە بەڕێوەبەری فرۆكەخانە بین، خۆ منیش و ئێوەش گەورە و بەڕێوەبەری ماڵی خۆمانین. باشە من چی بكەم بۆ ئەوەی كە منداڵەكانم خۆشحاڵ بن؟ باشە هیچ شتێك بۆ ئەو مەسەلەیە دەكەم؟ باشە من دەبێت چی بكەم بۆ ئەوەی هاوسەرەكەم خۆشحاڵ بێت؟ دەزانم كە خاتونەكان ئەمكارە دەكەن، چونكە حەزیان لێیەتی. پیاوەكانیش ئەگەر كاتیان هەبێت و لەبیریان بێت، بەدڵنیاییەوە كاری لەوشێوەیە ئەنجامدەدەن.

***

چی بکەین بۆ ئەوەی گەڕەکەکەمان ببێتە جێگەیەی زۆر جوانتر لە هەموو شوێنەکانیتر؟ ئایا لە پاکوخاوێن ڕاگرتنی سەتڵی خۆڵ و توالیتەکاندا هەوڵ و کۆشش دەکەم؟ ئایا ئەو شوێنانە ئەوەندە پاکوخاوێنن کە من ناچاربم وێنەی پێچەوانەی مێش و مەگەز بەدارو دیوارەکەیدا هەڵبواسم؟ یاخود دەبێت مێش و مەگەزە ڕاستەقینەکان بخەمە لاوە بۆ ئەوەی بتوانم بچمە ناو توالیتە کەوە؟

***

با پرسیار لە خۆمان بکەین. ئایا لە شێوازی لەبەر کردنی جلوبەرگ، لە پاکوخاوێنی شەخسیمان، لە دەربڕینماندا، لە قسە و هەڵسوکەوت و ڕەفتارماندا، ڕەچاوی جوانیی دەکەین؟ کارێك دەکەین کە خەڵکی لە مامەڵەیان لەگەڵ ئێمەدا خۆشحاڵ بن و چێژ وەربگرن؟ ئایا ژینگە و شوێنی ئیش و کارەکانمان پاکوخاوێنن؟ بۆنی خۆشی لێوە دێت. ئایا کەسێك کە دێتە پرسگەکە بە هەڵسوکەوتێکی جوانەوە پێشوازی لێدەکات؟ ئەگەر کەسێك هاتە ناو فرۆشگاکەمانەوە، ئایا فرۆشیارەکەمان بە شێوەیەك ڕێنمایی کڕیارەکە دەکات کە وا هەستبکات بەرژەوەندییەکانی دەپارێزرێن؟

***

ڕەزامەندی کڕیار، بیروباوەڕی کڕیار و ڕێزی کڕیارە لە دەزگاکەدا کە ڕێزو گەورەیی بۆ ئەو شوێنە دەهێنێت. نەوەك فرۆشتنە ڕۆژانەکانی. لە کەنەدادا فرۆشگایانێك هەن کە نزیکەی دە ساڵە من شتیان لێدەکڕم. بێجگە لەمە هیچ ڕێگەیەکیتریان بۆ

نەهێشتومەتەوە ! بەردەوام کۆمەڵێك هەلومەرجم بۆ فەراهەم دەکەن کە بتوانم کالاّ و شتومەکەکانیان بکڕم. بە نرخی باش، هەلومەرجی باش و خۆشحاڵ و ڕازیش بم.

***

ئێمە چی بۆ موشتەری و کڕیارەکانمان دەکەین؟ ئەگەر من لێپرسراوی شارەوانی یاخود بەڕێوەبەرایەتیەکانی دەوڵەتم، چی دەکەم بۆ ئەوانەی کە لەسەرو خۆمەوەن؟ خۆشم دەوێن؟ من کە باوەڕم بە خودا هەیە، ئایا ڕێز لە بەندەکانی دەگرم، ئایا ڕێز لە بەندەکانی دەگرم؟ پارە وەردەگرم یان نا، موچە وەردەگرم یان نا، ڕازیم یاخود ڕازی نیم و...هتد؟ بە هەرحاڵ من ئەو ئەرك و لێپرسراویەتیەم قبوڵکردووە.

***

بەدڵنیاییەوە ئەو کەسەی کە توالیتی ئەو فڕۆکەخانەیە پاکدەکاتەوە، یاخود ئەو پێشکارەی ڕێستورانەکە، موچەیەکی مامناوەند وەردەگرێت، بەلاّم کارەکەی خۆی خۆشدەوێت، لەبەر ئەوەی کە کارەکەیشی خۆش دەوێت، گەشە دەکات. با دەست بخەینە ناو دەستی یەکتری و بڕیاربدەین لەو شوێنەی کە خۆمانی تێدایە کارێك بکەین کە جیاواز بێت. سەرنج بدەینە ڕەوشت جوانی، جوانی ڕواڵەتی، خۆشگوزەرانی و ئارامی و شادی. دەبێت بزانین ئەمانە بەهان. پاکوخاوێن بوون بەهایە. جوان بوون بەهایە.

بۆنخۆش بوون بەهایە. خزمەتکردن هەر بەهایە. شادومان بون و شادومانکردنی خەڵکی بەهایە. با بەباشی باوەڕ بەمانە بکەین.

***

تاوەکو باوەڕ بەمشتانە نەکەین، هیچ شتێك ڕونادات. با خۆمان ئەو کەسە بین کە ئەمانەوێت ئەنجامیبدەین. ڕەچاوی خۆمان بکەین. من پەیمان بە ئێوە دەدەم کە ئەگەر ئێوە هەر لە ئەمڕۆوە بڕیاربدەن، کە باشترین جلوبەرگ لەبەر بکەن، بۆنتان خۆش بێت، پاکوخاوێن و شیك بن، دڵنیابن هەرشتێك ڕووبدات لەسود و بەرژەوەندی ئێوەیە. تەنانەت ئێمە لە سیمینار و خانە فێرکارییەکانی هاوسەرگیریدا، ئامۆژگاری دەکەین کە لە ڕۆژەکانی پشویشدا لەماڵەوە هەر جلوبەرگی شیك و جوان و پاکوخاوێن بپۆشن. خۆ ناڵێین لەڕادەبەدەر جلوبەرگی جوان لەبەر بکەن. بەڵکو دەڵێین ئەگەر چاکەت و بیجامەشتان لەبەردایە هەوڵبدەن پاکوخاوێن بن، با سەروڕیشتان ڕێکوپێك و جوان بێت. جیاوازی ناکات، هاوسەر و منداڵەکانتان پیاو یاخود ژنێکی جوان ببینن باشترە یان بونەوەرێکی ماندوو شپرزە و لەش و لار نارێك؟ چ کەسێك لە هاوسەرەکەم شیاوترە بۆ ئەوەی من بە شیك و جوان و پێکەوتەییەوە ببینێت؟ دەبێت نوسینگەی ئیش و ماڵەوە و جلوبەرگەکانیشم هەر هەمویان پاکوخاوێن بن.

***

ئێمە موسوڵمانین و پاکوخاوێنیش بەشێکە لە ئیمان و باوەڕەکەمان. لە هەموو ئادابە ئاینیەکانی ئێمەدا، گرنگی و سەرنجێکی زۆر دراوەتە پاکوخاوێنی. دەبێت پاکیزە بین. کاتێك ئەمانەوێت بچینە بەردەم خودای گەورە، دەبێت پاکیزە بین. بۆ میوان دەچینە گەرماو، هەر لەبەر خودا دەبێت پاکوخاوێنتر بین، ئەمەش شایستەی ئێمەیە. ئەخلاقێکی زۆر باش و جوانە. سەیر ئەوەیە کە ئەگەر ئێمە بەمجۆرە هەڵسوکەوت بکەین، ئەوکات منداڵەکانمان بە ڕاست و دروستیەوە پەروەردە دەبن و فێری ڕەوشتی باش دەبن، هێندە بەسە کە تەنها یەك نەوە، ئەمکارە ئەنجامبدەین. تەنانەت لە ٤ بۆ ٥ ساڵی یەکەمی ژیاندا، بەشێوەیەکی خۆکار و ئۆتۆماتیك جیلوەی هەموو کارەکان دەگۆڕدرێت. با هەر ئێستە بڕیاربدەین و جێبەجێی بکەین و چاوەڕوانی هیچ کەسێك نەبین. خۆتان دەستپێبکەن. پەیمان بە خۆتان بدەن کە توالیتەکانتان هەمیشە بۆنخۆش و پاکوخاوێن بن و هیچ تەنێکی نامۆیان تێدا نەبێت.

***

هەر ئەمڕۆو هەر ئێستە بڕیاربدەین کە هەموو ڕۆژێك کەمێك لە ژیانمان باشتر بکەین. جلوبەرگمان، ئەخلاقمان، خزمەتگوزاریمان، ژینگەکەمان، شارو وولآتمان پاکوخاوێن ڕابگرین. با هەمیشە جوان و پێکەوتە، کارا، دەمبەخەندە و میهرەبان بین، هەرکارێك کە ئەنجامیدەدەن، ئەگەر پاککەرەوەن، کارگوزارن، بەڕێوەبەر یان

وەزیر یاخود ژنی ماڵەوەن، پاکوخاوێن و جوان و میهرەبان بن. ئەنجامدانی ئەمکارە گونجاوە و ئێوەش دەتوانن ئەنجامیبدەن، یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی بە هەمومانەوە دیمەن و ڕواڵەتی ئێران بگۆڕین. ئەمەش کارێکە لە دەستی ئێمە و ئێوە دێت و هەر ئەوەش بەسە بۆ هەمولایەکمان.

# عاشق ببە

*عاشق شو ار نە روزی کار جهان سر اید*

*ناخواندە نقش مقصود در کارگاە مستی* *

ئەم شیعرە کاریگەرییەکی قوڵی کردووەتە سەرمن و زۆریش هۆشداری دەر و بێدارکەرەوەیە، ئەگەر بەباشی ئاگامان لە خۆمان بێت، ئەوا کاری ئێمە لەم دوونیایەدا بریتیە لە عاشق بون. هەستی ئیلاهی هەروەك حەزرەتی حافیز دەڵێت، یەك ئامانج زیاتری لە ژیاندا بۆ ئێمە دانەناوە، (عاشق ببە، وەگەرنا ڕۆژێك دێت کە جیهان کۆتایی بێت) تەمەنمان تەواو دەبێت و هێشتایش تێنەگەیشتوین بۆچی هاتوینەتە سەر ئەم ژیانە. مەبەست لە ئافراندنی ئێمە چی بووە. لەبارەی عەشقەوە قسەوباسی زۆر کراوە. بەتایبەت لە ئەدەبیاتی فارسیدا قسەی زۆری لەسەر کراوە. بەڵام بابزانین ئەم عەشقە چییە کە ئێمەی لە پێناودا ئافرێنراوە؟

***

---

* واتە: عاشق ببە، وەگەرنا ڕۆژێك کە جیهان کۆتایی دێت و بەبێ ئەوەی کە بزانین لەناو کارخانەی هەستیدا ڕۆڵ و ئەرکمان چییە.

عەشق وەك چیمەنتۆ و کەتیرە و سیکۆتینە، هەموو بەشەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. دیوارێکی خشتی هەڵبچنن. ئەگەر بێت و چیمەنتۆ بەکار نەیەت و ووشك بێت، ئەوا بە یەك لێدان هەرەس دەهێنێت و دەڕوخێت. ئێمەی مرۆڤ زۆربەمان بینا و پێکهاتەی ژیانمان وەك ئەو دیوارانەیە کە لەسەردەمی منداڵیدا بە خشت دروستمان دەکردن. ئەگەر پاڵیان پێوە بدەن، بەدڵنیاییەوە دەڕوخێن. توانای خۆڕاگرییان تێدا نییە. بناغەیان نییە. ئەندازیارێکی باش و وەستایەکی باش، بەباشی دەزانێت کە دەبێت ئەم خشتانە بلکێن بەیەکترییەوە. چیمەنتۆ و ملّتە پاش ئەوەی کە لەنێوان خشتەکان و چینەکانی دیوارەکەدا ووشك بویەوە، ئەوکات نەك تەنها خۆت، بەڵکو سەدان کەسیش دەتوانن پاڵی پێوە بدەن. ژیانی باش و پڕ بەرهەم، خانەوادەی شاد، کۆمپانیای شاد، شوێنانێکن کە سیکۆتین و چیمەنتۆی عەشقیان هەیە. بە جۆرێك لە جۆرەکان تێگەیشتون کە بۆچی خەلق کراون. بەجۆرێك لە جۆرەکان تێگەیشتون کە بۆچی لەناو ئەم ژیانەدان. کاری کۆمپانیا ئەوە نییە کە بەیانی تاوەکو ئێوارە کۆمەڵێك خەڵکی لەژێر سەقفێکدا کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی بەیەکەوە شەڕو ئاژاوە و هات و هاوار بکەن. ئامانج و مەبەستی کۆتایی ئەوکارە چییە؟ مەبەست کۆکردنەوە و کەڵەکە کردنی پارە و سامان نییە. ئێمە ئامانجێکمان هەیە. ئامانج و مەبەستی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی و تەندروستی و شادی و ئارامی بۆ هەموانە. بیری لێبکەنەوە کە هەرچییەك پارە کە کۆی

دەکەنەوە لە شوێنێکدا کۆ بکرێتەوە. کێوێك لە پارە دروستبکەن، بەڵام نەتوانن سودی لێوەربگرن، یان خەڵکانیتر دەستیان پێی نەگات. چ سودێکی هەیە؟

***

بەدڵنیاییەوە ئێوەش وەك من لەوباوەڕەدان کە هەموو ئەم جوڵە و چالاکیانەی کە ئێمە بەدرێژایی شەوو ڕۆژ هەمانە، بە مەبەست و بۆ ئامانجێکی دیاریکراوە. ئەویش ئەوەیە کە ڕاهێنان لەسەر عەشق بکەین. هەرکارێك کە دەیکەین، دەبێت ڕەنگ و بۆی عەشق و دەنگ و ئاوازی عەشقی تێدا بێت. گۆرانیبێژێك بهێننە پێشچاوی خۆتان کە تەنها لەبەر ئەرك و وەزیفە گۆرانی دەڵێت، یاخود گۆرانی بێژێك کە بە عەشقەوە گۆرانیەکانی دەڵێت، چەندە لەیەکتری جیاوازن. لەوانەیە نۆتەکانی ئەوەی دووەم دەربچن، بەڵام ئێوە کاتێك ئەو گۆرانیبێژە عاشقە گۆرانی دەڵێت هەست بە عەشق دەکەن. گوندنشینێك کە بەشداری لە وانەکانی فێربونی موسیقادا نەکردووە، کاتێك گۆرانیەکانی بەوپەڕی چێژ و خۆشییەوە دەچڕێت، کاریگەری دەکاتە سەر ئێوە. تەنانەت کاریگەری دەکاتە سەر ئەو کەسەیشی کە زمانێکی گۆیای نییە. عەشق سنوری نییە. ئەوە ئێمەین ئەو سنورانەمان کێشاوە. عەشق ژن و پیاو ناناسێت. مردو و زیندو ناناسێت. عەشق بگاتە هەر شوێنێك زیندوی دەکاتەوە.

مُردە بُدم، بُدم زندە شدم، گریە بُدم خندە شدم

دولت عشق امد و من دولت پایندە شدم

واتە: مردوبوم زیندوبومەوە، گریان بوم کەوتمە پێکەنین، دەوڵەتی عەشق هات و منیش بومە دەوڵەتێکی پایەدار و بەهێز.

***

کاتێك عەشق دێت، خەندە بەدی دەهێنێت و گریان لەناو دەبات. کاتێك عەشق دێت پایەندە و پایەدار دەبێت. کاتێك عەشق دێت، شڵەژان و گومان و دودڵی و ترس دەگۆڕێت بە جوڵەیەکی سازندەیی. کاتێك عەشق دێت، حەز لە مردن دەگۆڕێت بۆ شەوقی ژیان. ئازیزی من، باشە دەبێت مەبەست لە ئافراندنی من و تۆ چی بێت؟ مەبەستەکە گوتراوە. دەیدۆزیتەوە. لە هەرشوێنێك مرۆڤێکی عاشق دەبینی، حاڵت باش دەبێت. کاتێك باسی مرۆڤی عاشق دەکەم، مەبەستم ئەوە نییە کە ژن و پیاوێك عاشقی یەکتری بن. تەنها مەبەستم ئەو ووزانە نییە. ئەوە بەشێکە لە عەشق. چونکە عەشق فراوان و بەردەوامە. تەنها دەبێت دەرگا بکەیتەوە و ئامادە بیت تاوەکو ئەم خشتانەی ژیانت، کە بریتین لە فێربونەکانی زانکۆ و ئەو لێهاتن و شارەزایی و گوتانەی کە فێریان بویت، بلکێن بەیەکەوە و چیمەنتۆ و سیکۆتینەکەیشی عەشقە. کاتێك چیمەنتۆت لێدا ئەوکات دیواری ژیانت بەهێز و تۆکمە دەبێت. گومان و دودڵی لەناو دڵ و درونتدا دەچێتە دەرەوە. دڵ و جەرگی شێر پەیدا دەکەیت و دەبیتە پاشای جیهان. تەنها دەبێت ڕاهێنانی لەسەر بکەیت. ئێستە دەپرسیت چۆن ڕاهێنانی لەسەر بکەم؟

***

ئێمە لە ماڵەوە فێری عەشق دەبین. زانکۆی عەشق ماڵەوەیە. منداڵەکانمان ڕەگ و ڕیشەکانی عەشق لەماڵەوە فێر دەبن. پەیامی بنەڕەتی و سەرەکی فێرکارییەکانی من ئەمەیە: (خۆت خۆش بوێت، یارمەتیدەریش بە تاوەکو خەڵکیش زیاتر خۆیان خۆش بوێت). ئەگەر منداڵەکانمان بە مەرجدار پەروەردە بکەین. ئەگەر بێ دریغ عاشقی منداڵەکانمان نین، گرنگیان پێنادەین و زۆر خۆشمان ناوێن، دەڵێین ئەگەر نمرەی ١٠٠ وەربگریت خۆشم دەوێیت، ئەگەر بیکەیتە نمرەی ٧٠ خۆشم ناوێیت، کوڕی فلانەکەس یاخود کچی فلانەکەس زۆر لە تۆ باشترە، ئەوکاتەیە کە ئەم منداڵ هەست بە نەویستراوی دەکات. بەردەوام ڕاهێنان لە دژی عەشق دەکات. فێری ئەوە نەبووە کە دواتر بڵاوبکاتەوە، فێر نەبووە کە دواتر بیری بێتەوە و جێبەجێی بکات. ژیان گریانی تێدایە. ژیان ناکامی تێدایە. بەڵام دەوڵەتی عەشقێك ناناسێت کە بێت و مسی بون و وجودی بگۆڕێت بە زێڕ.

گویند سعدی روی سرخ تو چ زرد کرد؟

اکسیر عشق در مسم امیخت و زر شدم

واتە: دەڵێن سەعدی ڕوی سوری تۆ بەچی زەرد بوو؟ کیمیای عەشق هات و تێکەڵ بە مسەکەم بوو بومە زێڕ.

***

ئەو کەسەی کە کیمیای عەشقی پێبگات، ئەوکات مسی بون و وجودی دەبێتە ئاڵتون. بەدوای چیدا دەگەڕێین؟ با ڕاهێنان لەسەر

ئەمە بکەین. ئەم قسانەی بۆ ئێمەیان دەکەن کە گوایە (عاشقی نەبوەتە نان و ئاو، نوسین کە نەبویە نان و ئاو)، باشە ئێمە ئەم نان و ئاوەمان بۆچییە؟ مەبەست لە ئافراندنی ئێمە لەم کارخانەی هەستیەدا چییە؟ با مەبەستەکەی بخوێنینەوە و جێبەجێی بکەین.

دایکو باوکی ئازیز، عاریفێکی گەورە، کە جیلوەی یار لەناو هەموو بەشەکانی هەستی و دونیادا دەبینێت، دایکێکی میهرەبان، مامۆستایەکی میهرەبان، ڕێبەرێکی مرۆڤ دۆست و میهرەبان، ئەمانە هەمویان لە ماڵەوە ڕاهێنانی عەشقیان کردووە. فێری ئەوە بوون کە خۆشەویست بن و بە قوڵی هەستی پێبکەن، لەبەر ئەوەی کە بەباشی فێری ئەو چەمکە بووە، بڵاوی دەکاتەوە و فراوانی دەکات.

با گۆزەکانی بون و وجودی منداڵەکانمان پڕ و لێانلێو بکەین لە عەشق. عەشقێك کە دواتر دێت بە هانایانەوە و گریانەکانیان دەگۆڕێت بە خەندە و پێکەنین و مردنیشیان دەگۆڕێت بە ژیان. ئەو عەشقەی کە ئەوان دەگۆڕێت بە دەوڵەتێکی پایەدار. هەرچییەك کە لە دونیادا ماوەتەوە، بەهۆی عەشقەوەیە. هەرچیەکیش لەناو چووە لەبەر بێ عەشقی لەناوچووە.

وەرن با منداڵەکانمان بەوجۆرەی کە هەن قبوڵیان بکەین. خۆشمان بوێن و ڕێزیان لێبگرین. ئەمەش گونجاو نییە مەگەر ئەوەی کە باوکی ئازیز و دایکی بەڕێز و ڕاهێنەری ژیر و ئەرکناس، سەرەتا خۆت هەر بەوجۆرەی کە هەیت قبوڵبکەیت، خۆتت خۆش بوێت و ڕێز لە خۆت بگرە. کاتێك کە پڕ و لێوانلێو بویت، هیچ چارەیەکت

نییە، چونکە بون و وجودت پڕ بووە لە شیرینی و شیلەی عەشق. هەرکەسێك لێت نزیك ببێتەوە سود و بەهرە لەم عەشقەی تۆ وەردەگرێت. ئەوکاتەیە کە تۆ بڕۆیت بە ڕێگادا، وەستابیت، بخەویت، بنوسیت، بخوێنیتەوە و هەرکارێکیتر بکەیت، دونیا دەکەیتە شوێنێکی باشتر. بەهۆی تۆوە هەموو دونیای دەووبەرت ڕوناك دەبێتەوە. با بێین و بە منداڵەکانمان بڵێین کە بە بێ هیچ کۆت و بەندێك خۆشمان دەوێن. پێیان بڵێین بەلای ئێمەوە گرنگ نییە کە نمرەی ١٠٠ وەردەگریت یان نمرەی تاك. ئەگەر ئافەرینت دەکەین، لەبەر خاتری داهاتوی خۆتە. بەڵام لە هەر هەلومەرج و هەر پێگەیەکدا بێت، ئێمە تۆمان زۆر خۆشدەوێت، تەنانەت ئەگەر لەگەڵیشتدا جیاواز بین. هێشتا هەر تۆمان خۆش دەوێت. با بە هاوسەرەکەمان بڵێین، ئەوەی پێبڵێین کە ئازیزەکەم من لەم باریەوە لەگەڵتدا هاوڕا نیم، لەوانەیشە هەڵە بم. بەڵام تۆم خۆشدەوێت. چونکە خۆشویستن لە شتەکانیتر جیاوازە. بریتیە لە چیمەنتۆ و سیکۆتین. ئیتر خشتەکەی هەرچیەك هەیە با ببێت. دەبێت عەشق ئەمانە بلکێنێت بەیەکەوە. ئەمەش بە ڕاهێنان دەکرێت و شتێکە کە مرۆڤ دەتوانێت فێری ببێت.

***

جۆری مرۆڤ توانا و لێهاتنی عەشقی بە ڕێژەیەکی زۆر تێدایە، هەربۆیە دەبێت ڕاهێنانی پێبکەین و ئاشکرای بکەین. دەبێت بەبێ درێغ کردن دەری بخەین. ئەوکات دەبینن کە ناگرین. ئەگەر

گریانێکیش هەبێت، لە شەوقەوەیە، نەوەك لە خەم و پەژارەوە. چونکە لە شوێنێکدا کە عەشق هەیە، خەمو پەژارە بوونی نییە. دودڵی و دڵەڕاوکێ بونی نییە. دەتوانن بە ئیسراحەت و بێ خەم پاڵبدەنەوە. دەتوانن ڕێگەبدەن کە خەڵکانیتر پاڵبدەنەوە و هیچ خەم و پەژارە و هەراسانیەکیشیان نەبێت. منداڵەکانمان بەوپەڕی شادومانییەوە یاری دەکەن، چونکە دڵنیان لەوەی کە دایکوباوکیان خۆشیان دەوێت. منداڵەکان بەیەکەوە قسە دەکەن و ئیتر خەمی ئەوەیان نییە کە دایکیان خۆشی دەوێن یان نا.

***

بە گریمانی زۆر، ئەوانەی کە عەشق بەرامبەر بە خود و ڕێز و ئیحتیرام لە خود لەناو بون و وجودیاندا زۆرە، توشی نەخۆشییە بێچارەسەر یاخود چارەسەر قورسەکان نابن، لە شەقامەکاندا زیان بە خۆیان ناگەیەنن، توشی مادەی هۆشبەر نابن. چونکە عەشق لە بون و وجودیاندا هەیە. تەنانەت ئەگەر مسیش بن، کاتێك عەشق هات، دەبنە ئاڵتونی پاکوبێگەرد. وەرن با ڕاهێنانی عەشق بکەین. (عاشق بوون) واتە من کە عاشق دەبم. چاوەڕوانی هیچ بەرامبەرێك لەکەس ناکەم. بی درێغ کردن عاشق بە و خەڵکت خۆشبوێت، بێ درێغکردن ببەخشە و لەخەڵکی خۆش ببە، بێ درێغکردن بڵێ، بۆ ئەوەی جیهانی هەستیش بە بێ درێغ هەرچییەکت دەوێت پێتی بدات، کە پێش هەمویان خۆشی و شادومانی و متمانەبەخۆبون و پاشایەتی جیهانە.

## ئاونگەکانی بون و وجودمان هاوسەنگ و هێمن بکەینەوە

ئاونگ کەرەستەیەکە کە زۆرێك لە خەڵکی بینیویانە. زۆربەی کات لەسەر شێوەی تۆپەڵێکە کە بە پەتێکەوە شۆڕ بوەتەوە. ئاونگ چەند تایبەتمەندیەکی سەرنجراکێشی هەیە. یەکێکیان ئەوەی کە بەری جوڵەکەی پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئێوە لە کوێوە دەستتان پێکردبێت. هەرچەندە تۆپەڵەکە لەلایەکەوە بەرزتر بکەنەوە، ئەوا لەلاکەی تریشەوە بەرزتر دەبێتەوە.

تایبەتمەندییەکی تری ئاونگ بریتیە لەوەی کە لە هەر لایەکەوە بیجوڵێنین ئەوا کاتی چون و گەڕانەوەی پەیوەندی بە درێژی پەتەکە یاخود هەڵواسینیەوە هەیە. پەیوەندی بە ئەندازەی بەرز و نزمکردنیەوە نییە. ئەم ئاونگە دەتوانێت وانەیەکی سەرنجراکێشمان پێبدات. وانەکەیشی ئەمەیە:

ئەگەر من وابزانم بە توندوتیژی دەتوانم مەسەلەکانی خۆم چارەسەر بکەم، ئەوا کاردانەوەی لە لاکەی ترەوە دەبێتە هەرج و مەرج و بێسەروبەری. ئەگەر شتەکان زۆر بەسەختی وەربگرین، ئەوا لەلاکەی ترەوە شل و شێواو دەبێت. ئەگەریش زۆر توند پاڵی

پێوەبنێم، ئەوا لەلاکەی ترەوە کارەکان تێکدەچن. ئەم ئاونگە دەتوانێت لە ژیاندا وانەیەکی فێرکارانەمان پێبدات. ئەگەر لە ژیانماندا، لە ماڵەوەماندا، توشی کێشەیەك دەبین، ئەوەمان لەبیر بێت کە لەوانەیە لەبەر توندی مامەڵەکردنمان بیچت لەگەڵ مەسەلەکەدا، لەوانەیە بە ڕواڵەت بتوانین زاڵببین بەسەر ئەو قەیرانەدا، بەڵام دەبێت لەوە دڵنیابین کە ئەوە ڕێگەچارە نییە و کاردانەوەکانی ئەو توندوتیژییە لە داهاتودا دەبینیەوە و زینمان پێدەگەیەنن.

***

ڕێگەچارە، پێویستی بە مەتانەت و هەڵسەنگاندن و فیکر و ئەزمون و فێرکاری هەیە. ئەو خێزان یاخود ئەو کۆمپانیایانەی کە بە ترسەوە بەڕێوەدەبرێن، دەبێت چاوەڕوان بن کە ئەم دیواری ترس و ساردوسڕییە، بەزویی تێکبشکێت و ببێتە هەرج و مەرج و بێسەروبەری. ئەگەر لە ژیانتاندا ڕێکخستنێکی وەسواسانەتان هەیە و هەموو شتێك کۆنترۆڵ دەکەن، ئەوە بزانن کە ڕۆژگارێك دێت کە ئەو بەربەستە دەشکێت و هەموو شتێك تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت و دەشێوێت. ژیانی هاوسەنگ ئەو ژیانەیە کە بەرزو نزمیەکانی قبوڵکراو بن. سەرنج بدەن کە درێژایی چون و هاتنەوەی تۆپەڵە ئاونگەکە یەکسانە. واتە پێویست ناکات بۆ گەیشتن بە هاوسەنگی و ئارامی، هەر دەبێت لە کۆتا شتەکان سود وەربگیرێت. کاتێك سود لە کۆتاییەکان وەربگرن و ناچار بین سود لە توڕەیی و ستەم و

هەڕەشە وەربگرین، نیشاندەری ئەوەیە کە تەگبیرەکەمان ڕاست و دروست نەبووە. ئەگەریش زۆر بێ سەروبەر بجولێینەوە، دیسانەوە دەگەین بە جێگەیەك کە ناچارین ستەم و زۆرداری بکەین. هاوسەنگی ڕاستەقینە ئەو هاوسەنگیەیە کە مرۆڤ لە ناوەڕاست و کەمێکیش لەمبەر و ئەوبەرەوە بێت. ئەوکات بەرزو نزمیەکانیشی قبولکراون. ئەگەر کۆمەلگە یان کۆمپانیا یاخود خێزانێك یان تاکەکەسێك، لە ژیانیدا قەیرانگەلێکی زۆری هەیە، ئەمە نیشاندەری ئەوەیە کە بەپێی یاسای (ئاونگ و تۆپەڵەکە) لە کۆتاییەکاندا خەریکە بڕیاری خۆی دەدات. ئەگەر زۆر بەرزیت، ئەوا هێواش هێواش وەرە خوارەوە و لە خوارترەوە بەری بدە. ئێستە ئەم سیستەمە دەتوانێت ئەوە قبوڵبکات کە ئەگەر لە ژیانتدا زۆر فشار و کۆنترۆڵ هەیە (ئیتر چ کۆمپانیا چ خۆت و...هتد) هاوسەنگتر بە. لەم حاڵەتەدا توشی بەرزونزمییە توندەکان نابیتەوە. یاسای ئاونگ وانەیەکە کە ئێمە لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا دەتوانین سود و کەڵکی لێوەربگرین و لە ژیانی ڕۆژانەماندا بکاری بهێنین.

***

ئەگەر لەناو خێزانەکەتدا بەرزو نزمی زۆرت هەیە، (بۆ نمونە شەوێك حەجت لەسەر واجب بوو شەوێکیش زەکات) ئەوە بزانە کە لە کۆتاییدا دەژیت. ئەگەر فشاری زۆرتان بۆ هات، ئەوەتانە لەبیربێت کە کاردانەوەی توند و خێرا و تووڕەی ئێوە بە زیانی خۆتان و هەموو ئەو مرۆڤانەیە کە لەناو ئەو سیستەمەدان. لەناوەڕاستەوە

دەستبکەنە بەرزونزمکردن. بۆ نمونە ڕووداوێك ڕودەدات، باشە، ئێمە دەتوانین تامڵ بکەین و سەبرمان هەبێت. بەڵام ئەگەر ئامادە نەبین و پێشهاتێکی پڕ لە ترس و لەرز و ئستریس ڕووبدات، بمانەوێت و نەمانەوێت دەکەوین بەملا و ئەولادا و دەکەوینە خوارەوە و لەژێاندا شکست دەهێنین.

***

پێشنیاری من ئەوەیە کە لەبری کاردانەوەی ڕووت، بوەستین و بیر بکەینەوە و یارمەتی لە دەوروبەرەکانمان وەربگرین. نەڵێین خەتای خەڵکی دەوروبەرمانە. با واز لەم قسانە بهێنین و ئەرك و لێپرسراویەتی بگرینە ئەستۆ. من چی بکەم بۆ ئەوەی ئاونگ و تۆپەڵەی ژیانم لە هاوسەنگی بەردەوامدا بێت و بۆ خۆم و بۆ خەڵکیش متمانە بەدی بهێنێت؟ کەسێك کە بەیەك شەو پارەیەکی زۆر بەدەست دەهێنێت و شەوی داهاتو هەژار دەکەوێت، خەڵکی لە پێدانی قەرز بەم کەسە هەراسان دەبن. کەسێك کە لەڕوی ئەخلاقیەوە، کتوپڕ ئەوەندە توڕە دەبێت کە بەرد دەهاڕێت و دۆو دۆشاو تێکەڵ دەکات و چەند ساتێك دواتر، هەروەك مۆم، نەرم و نۆڵ و میهرەبان دەبێتەوە، خەڵکی متمانەی پێناکەن. خۆ ناتوانین بڵێین ئەم کەسە بێ کەسایەتیە، بەڵکو بەڵگەی ئەم هەڵسوکەوتەی ئەو، بریتیە لە جوڵە و دەستپێکردن لەوسەرو لە کۆتایی تۆپەڵە و ئاونگەکەوە. هەر لەبەر ئەمەیە کە ئامۆژگاری دەکرێت لەکاتی توڕەییدا، بڕیار نەدەین و تەمبێی کەسیش نەکەین. چونکە لەکاتی

تورەییدا خودی تورەییەکەیە کە بڕیار دەدات و بیر لە پاشهاتەکانی ناکاتەوە. بۆ نمونە لە منداڵەکەت تورە دەبیت، کەمێك سەبر بکە، ئاوێك بخۆرەوە، پیاسەیەك بکە و دەگە لە خۆت و منداڵەکەت مەدە. ئەو پیاوەی کە کتوپڕ تورە دەبێت و هەڵدەچێت و دەڵێت کە سێ تەلاقەی ژنەکەم دەدەم و لێی جیادەبمەوە، یاخود ژنێك کە کتوپڕ تورە دەبێت و ماڵ و مێردی خۆی بەجێدەهێڵێت، بێجگە لە ئاهی سارد و پەشیمانی هیچ شتێکی لێناکەوێتەوە. لەکاتی تورەییدا ئەوە سروشتیە کە لە تورەبونەکەی خۆم ڕازی بم و بڵێم کارێکی باشم کرد، بەڵام دڵنیابن کە ئەم تۆڵەیە هیچ سودێکی نابێت، چونکە لە کۆتاییدا دەبمە کەسێکی نەرێنی، دواتر و لەولاشەوە کاتێك هێور بومەوە و هاتمەوە سەرخۆم، هەموولایەك دەبەخشم، ئەمەش گەورەتری زیان لە ژیان و کەسایەتی مرۆڤ دەدات.

***

وەرن با بەیەکەوە ڕاهێنان بکەین. هەرکاتێك هەستتان بە فشارێکی گەورە کرد لە خۆتاندا کە بۆ نمونە دەبێت کەسێك لە شوێنی خۆی دابنیشێنن، یاخود شتانێکی هاوشێوەی ئەمە، بە خۆتان بڵێن من ئێستە لە کۆتایی تۆپەڵە و ئاونگەکەدام.... هێمن بن، هەناسەیەکی قوڵ هەڵبکێشن و داوا لە کەسێك بکەن کە کۆنترۆڵتان بکات، ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن. ئەمکارانە بەگشتی پێویست بە بەشداریکردن لە خولە فێرکاریەکان و خوێندنەوەی کتێبە پەیوەندیدارەکان و سەیرکردن و گوێگرتن لە سیدیە

فێرکارییەکاندا دەکات و لەمانەش گرنگتر بریتیە لە (ڕاهێنان) لەسەر فێرکارییەکان. خۆم مرۆڤێکبوم کە یان زۆر قسەم دەکرد یاخود گۆشەگیر بوم، بەڵام بە یارمەتی ڕاهێنەر و فێکارییە باشەکان و ئەڵبەتە خواستی خودای گەورەش، گەیشتمە جێگەیەك کە بگۆڕێم بە مرۆڤێکی تاوەکو ئاستێکی باش هاوسەنگ.

***

وەرن با ڕاهێنان بکەین کە ئاونگ و تۆپەڵەکانی بون و وجودی خۆمان هاوسەنگ بکەین. لێکۆڵینەوە دەرونناسیەکان ئەوەیان نیشانداوە کاتێك مرۆڤ توشی هەیەجان دەبێت (ئیتر چ ئەرێنی و چ نەرێنی، چ هەیەجان زەدە و چ تورە، چ بەلاتەوە خۆش بێت یان ناخۆش) یەك لەسەر سێی ئەقڵ و ژیری ئەو دەوەستێت، بەڵام ئەگەر ١٨٠ پلە ئایکیومان هەبێت و لە کەسە هەڵکەوتوەکان بین، کاتێك توشی هەیەجان ببین، بەشی بیرو هۆشمان دەبێتەوە بە ٦٠ (ئەمە لەکاتێکدایە کە پلەی نۆرماڵی بەشی بیروهۆشی ١٠٠)ە، واتە لەکاتی ئەو هەیەجانەدا وەك مرۆڤێکی دواکەوتو بڕیار دەدەین. خوێنساردی، ئارامی، مەتانەت و نەلەخشاوی، ڕێگەی ژیانی ڕۆژانەیە. با هەڕەشە لە هاوسەرمان، منداڵمان و خۆمان نەکەین. (بۆ نمونە ئەگەر ئەمجارە وەرنەگیرام، ئەوا بەڕێگەیەکیتردا دەڕۆم... یان ئەگەر بەگوێت کردم ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر بەگوێت نەکردم واو وات لێدەکەم) لەم حاڵەتەدا ئارامی ژیانتان تێکدەچێت. هەناسەیەکی قوڵ، هێمن و دڵنیا، تورەم، ئاران بومەوە... کاتێك

گەیشتمە ئێرە، ئەوکات بڕیار دەدەم.... با بەلایەنی بەرامبەرمان بڵێین (من وابیر دەکەمەوە، ئەی تۆ پێت چۆنە؟) ژنێك کە هەموو ڕۆژێك بتەوێت هەڕەشەی تەڵاقدانی لێبکەیت، یاخود خاتونێك کە هەڕەشە لە پیاوەکەی دەکات کە دەتۆرێت و ماڵەوە بەجێ دەهێڵێت، ئیتر بەمە ناڵێین ژیانی هاوبەش. ئەگەر من ڕۆژانە هەڕەشەی دەرکردن لە کارمەندەکەم بکەم، ئەوە ئیتر ژینگەی ئیش و کار نییە. ئەوە شوێنێکە کە پڕییەتی لە ترس و تۆقاندن. هەموان هەوڵ دەدە کە خۆیان بەجۆرێك لە جۆرەکان بشارنەوە یاخود لە وەها سیستەمێك ڕابکەن و بچنە دەرەوە. ئەگەریش بمێننەوە، ئیتر هیچکارێك ناکەن، بەڵکو بەردەوام ئاگایان لەوەیە کە تۆپەڵ و ئاونگەکە لێیان نەدات.

***

بەردەوام ئارامی و ئەقلگری، ئەنجامی باشی دەبێت. هەرجۆرە دەستپێشخەرییەکی سەرچاوەگرتو لە توڕەیی و نەفرەتەوە، (ئەگەرچی حەقیش لەلای من بێت) ئاستی ئەقڵ و بیرو هۆش و جیاکردنەوەی من کەمدەکاتەوە و دەیگەیەنێتەوە یەك لەسەر سێ، هەرچەندە لەوانەیە دەگەیەك لەلایەنی بەرامبەری بدات، بەڵام هیچ دەرئەنجامێکی نابێت و لە کۆتاییدا بە زیانی کەسە توڕە و هەڵچوەکە تەواو دەبێت. با بێین و تۆپەڵە و ئاونگەکانی بون و وجودمان هاوسەنگتر بکەین و کارێك بکەین کە خەڵکی دونیا و خۆیشمان متمانەمان بە خۆمان هەبێت. کارێك بکەین کە خەڵکی

بتوانن سەرمایەگوزاریمان لەسەر بکەن و ئێمە بە کەسانێك بزانن کە گونجاوین بۆ ئەوەی تامڵمان لەگەڵدا بکەن.

***

دەچین بۆ ئەوەی ئاونگ و تۆپەڵەکانی بون و وجودی خۆمان هاوسەنگ و هێمن بکەینەوە، ئەم ئارامی و مەتانەت و نەلەخشاوییە بگوازینەوە بۆ ژیانی و خۆمان و خەڵکی دەوروبەرمان.

# توندتر دەرگاكە دابخە

لە یەكێك لەشارەكاندا و یەكێك لە دامودەزگا گەورە جەماوەرییەكان، منیان بانگهێشتكردبوو بۆ ئەوەی قسە بكەم. پیشوازییەكی باشیان لێكردین و ڕێزێكی زۆریان لێگرتین و خەڵكانێكی زۆریش هاتبون. كۆڕێكی زۆر باش بوو. بەڵام كاتێك قسەمان لەگەڵ بەڕێوەبەری كۆمەڵەكەدا دەكرد، قسەو باسی جیاواز كران. تاوەكو گەیشتین بەم بابەتەی كە هەندێك لە كۆمەڵگەكان چەندە ئاڵۆز قسەدەكەن. بۆ نمونە ئەگەر من شتێكم دەوێت، نەریتی ئێمە لێرەدا بەوجۆرەیە كە ئەگەر من بمەوێت ئۆتۆمبیلەكەی تۆ بە قەرز وەربگرم، ناڵێم ( فلانەكەس سەیارەكەتم بە قەرز پێبدە)، بەڵكو دەڵێم (ناتەوێت بچیت بۆ هیچ شوێنێك؟) بەرامبەرەكەیشم دەڵێت: نەخێر، دەپرسم (سەیارەكەت هیچ كێشەیەكی نییە؟) خاوەنەكەیشی دەڵێت (سەیارەیەكی باشە و هیچ كێشەیەكی نیە). بەكورتی دوو بۆ سێ سەعات لەگەڵ كەسی بەرامبەر و خاوەن ئۆتۆمبیلدا قسە دەكەن بۆ ئەوەی داوایەك بكەن و ماوەی یەك دوو كاتژمێر سەیارەكەی بدات بەلاتانەوە بۆ ئەوەی بچن بۆ شوێنێك و بگەڕێنەوە. ئەمە لەكاتێكدابوو كە هەر لەو سەرەتایەوە دەتانتوانی

ئەم داواکارییە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەکەسەکە بڵێین. بەڵام لەسەر ئەم هەڵسوکەوت کردنە ئاڵۆزە ڕاهاتوین، تەنانەت بۆ بابەتە زۆر سادەکانیش.

***

دەبێت فێری ئەوە ببین کە ئەگەر بمانەوێت بەخێرایی پێشبکەوین، ئەگەر بمانەوێت گۆڕانکاریگەلێکی قوڵتر بەدەستبهێنین، چ باوەڕ بکەین و چ باوەڕ نەکەین، جۆری دەربڕینمان و جۆری پەیوەندییە زارەکیەکانمان و جۆری ڕەفتار و گوفتار و تەنانەت نوسراویشمان، کاریگەری لە ڕێژە و ئەندازەی ئەو سەرکەوتنەدا هەیە کە بەدەستی دەهێنین.

***

مۆڵەت بدەن نمونەیەکی سادەتان بۆ بهێنمەوە: با بیهێنینە پێشچاوی خۆمان کە گەڕاوینەتەوە بۆ ئەدەبیاتی ١٠٠ یان ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر، (حەزرەتی بەڕێزی گەورە) بەکورتی یەك دونیا زاراوە و لەفز بۆ دەستپێکردنی قسە. ئەمە ناکرێت. چونکە ئێوە ناتوانن لەسەردەمی ئینتەرنێت و مۆبایل و کورتەنامە و تەکنۆلۆژیادا، ئەوەندە قسە بکەن، تەنها لەبەر ئەوەی کە بتانەوێت مەبەستەکەتان بگەیەنن. بەڵکو دەبێت یەکسەر بچنە سەر ئەسڵی مەسەلەکە. ئەو داستانەی کە ئەم بەڕێوەبەرە گەنج و زیرەك و هۆشیارە بۆ منی گێڕایەوە، زۆر سەرنجڕاکێشە و یارمەتیدەرێکی باشە بۆ کرانەوەی ئەم بابەتە.

***

ئەم بەڕێزە دەیگێڕایەوە و دەیگوت: میوانێکمان هەبوو کە هەر لەمنداڵییەوە لە ئەڵمانیادا گەورە بوبو. کەسێکی زۆر سەرکەوتوو خاوەن بڕوانامە و زیرەك بوو، کە لە تەمەنێکی مامناوەندا بڕیاریدابوو بگەڕێتەوە بۆ ئێران و بەو ئەزمونە بەنرخانەی کە هەیبوو، خزمەت بە نیشتیمانەکەی خۆی بکات. ئەم بەڕێزە دەگەڕێتەوە و تەلەفۆن بۆ ماڵەوەیان دەکات و دەڵێت من کێشەم بووە و لە بنکەی پۆلیسم. ئەمیش بەسەرسوڕمانەوە دەڵێت ئێوە چیتان داوە لە شەڕ و بنکەی پۆلیس؟! دواتر کاشی بە عەمەل دێت و ئەم سواری تەکسی دەبێت، کاتێك دەگاتە جێگەی مەبەست، لە تەکسییەکە دادەبەزن و دەرگای تەکسییەکە دادەخەن. شۆفێری تەکسیەکەش پێی دەڵێت، (توندتر دایبخە!) ئەویش دووبارە دەرگاکە دەکاتەوە و بەتوندی دایدەخاتەوە و شەڕیان دەبێت. لێی دەپرسن بۆچی وادەکەیت؟ بەکورتی ئەو ئاگای لەخۆی نامێنێت و کاریان دەگاتە بنکەی پۆلیس. ئەم هاوڕێیەی ئێمە دەگێڕێتەوە و دەڵێت کاتێك ئێمە چوین بۆ ئەوێ، ئەوەمان بۆ شۆفێری تەکسیەکە ڕونکردەوە کاتێك تۆ بەوت گوتوە دەرگاکە توندتر دابخە، ئەویش بەگوێی تۆی کردوە و وایزانیوە کە هەر بەڕاستی دەبێت بیکاتەوە و دووبارە بەتوندتر دایبخاتەوە. لەبیرو زەینی ئەم مرۆڤەدا لەو وڵات و سیستەمەی کە ئەوی تێدا گەورە بووە، هەرکەسێك هەرچییەکی دەوێت، بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە دەیڵێت. جارێکیان کە چوبوم بۆ

ئەڵمانیا، لە کوڕە پورەکەم پرسی کە چ خاڵانێکم پێدەڵێت بۆ ئەوەی لەم وڵاتەدا و لەکاتی قسەکردنم لەگەڵ خەڵکەکەیدا ڕەچاویان بکەم، کوڕە پورەکەیشم ئاماژەی بە خاڵێکی سەرنجڕاکێش کرد. ئەم لەبەر ئەوەی کە ساڵانێکە لەوێدا دەژی و لە کۆمپانیای بنزدا ئیش دەگات، گوتی لێرە ئەڵمانیەکان زۆر کەسانێکی ڕاشکاون، قسەوباسەکانیان هەرچییەك بێت بەوپەڕی ڕاشکاویەوە بەبەرامبەرەکانیان دەڵێن. یەکەم ئەوەی کە چەلەحانێیان لەگەڵدا مەکە. ئەگەر دەتەوێت بە هەرزان کاڵاو شتومەکت پێبفرۆشن، پێشنیار بکە. ئەگەر بتوانن ئەوکارەت بۆ دەکەن، وەگەرنا ئیتر لەسەری مەڕۆ. دووەم خاڵیش ئەوەیە کە کاتێك ویستت شتێك باسبکەیت، یەکسەر بڕۆرە سەر ئەسڵی مەسەلەکە. زۆر بەپەراوێزدا مەڕۆ، چونکە تێناگەن، هەرشتێکی پەراوێز بڵێیت ئەوان وەك شتێکی سەرەکی و بنەڕەتی دەزانن.

***

یان دەتەوێت، یاخود ناتەوێت، یان ڕازیت، یاخود ڕازی نابیت. ئەگەر بتەوێت لە پیشەسازیدا بگەیت بە شوێنێك، بۆ ئەوەی ئەو سەیارانە دروستبکەیت و ئەو سیستەمە بەدی بهێنیت، شێوازی باسکردنی بابەتەکان و جۆری قسەکانت دەبێت بە شێوەیەك بێت کە ئێمە بگەیەنێت بەو پیشەیە. هیچکەسێك ناتوانێت بڵێت (ئەی هاوار) بەمشێوازە قسەکردنە ئێمە ناتوانین سەیارەیەکی خاوەن کوالێتی دروستبکەین. ئەگەر سیستەمەکە بخوێنیتەوە، دەبینن کە هەر

بەوجۆرەیە. ئەو کەسانەی کە لە کاروبارەکانیاندا قوڵن و زۆر حیساب بۆ کوالێتی دەکەن، جۆری ڕەفتار و گوفتار و هەڵسوکەوتیان جیاوازە. ئەگەر بمانەوێت پێش بکەوین، دەبێت فێری ئەوە ببین کە لەگەڵ هاوسەر یان منداڵ یاخود خەڵکانیتردا، هەتا بتوانین هەرچی کورتتر، خێراتر، ڕاشکاوتر و ڕونتر قسە بکەین باشترە. ئەوانیش فێر بکەین کە لەبەرامبەردا هەربەمشێوەیە قسەکانیان بکەن. سەردەمێك ئێمە چیرۆك دەگێڕینەوە. سەردەمێك ئێمە داستان دەگێڕینەوە و پەیوەندییەکانمان لەسەر بنەمای ئەو باس و بابەتانەیە کە هەر دەبێت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ قسە بکەین. ئەگەر دەتانەوێت پارەیەك قەرز بکەن، بەبێ پەراوێز و بە هیچ پێشەکیەك مەبەستەکەتان بڵێن. لەوانەیە هەندێك حەز بکەن مەسەلەکە زۆر ئاڵۆز بکەن و سوڕی پێبدەن، بەڵام پەروەردەی من بە جۆرێکە کە ئەگەر کەسێك بێت بۆلام و بیەوێت شتێك بڵێت، تکای لێدەکەم کە هەر لەوسەرەتایەوە بچێتە سەر ئەسڵی مەسەلەکە و کێشەکەی باسبکات. پێمبڵێت کە بۆچی هاتوە بۆلام. ئەگەر زۆر باسی ڕابوردو بکات، پێی دەڵێم ئێستە کێشەت چییە؟ ئێستە چ کارێکت هەیە؟ ئێستە چ حاڵێکت هەیە؟ هەربۆیە ئەو کەسانەی کە سەردانی من دەکەن، لەوانەیە هەندێکیان ٥ بۆ ١٠ ساڵ لەژێر چارەسەردا بوون، بەڵام بەگشتی لەماوەی دوو بۆ سێ دانیشتندا وەڵامەکەیان لەمن وەردەگرن . ئیتر یان دەتوانم یارمەتیان بدەم، یاخود ناتوانم.

***

هەندێك ئیش كە بەهیچ شێوەیەك لە پسپۆڕی مندا نییە و دەبێت ئەمە بە خەڵكی بڵێم. من ناتوانم دەرمان بدەم، ناتوانم دەستێوەردان لە كاروباری پزیشكیدا بكەم. كاتێك بۆم دەنوسن دەبێت ئەم دەرمانە دەخۆم، منیش لەوەڵامیاندا دەڵێم: ببورن من لەوبارەیەوە هیچ نازانم و ئەوە لە پسپۆڕی مندا نییە و دەیگێڕمەوە بۆلای كەسی پسپۆڕ و شارەزای ئەو بوارە. ئەگەر بێت و ئەم ڕاشكاوییە نەبێت، كاتی هەردوكمان دەگیرێت، ناتوانم یارمەتی بدەم، ئەویش ناڕازی و توڕە و ماندو دەبێت و نەك تەنها یارمەتیم نەداوە، بەڵكو دەرد و ئازارەكەیم زیاتر كردووە. ئەو دۆست و ئازیزانەی كە لەژینگەی كاردا، پەیوەندیان لەگەڵ مندا هەیە، بەباشی شارەزای هەڵسوكەوت و ڕەفتاری منن. پێیاندەڵێم چیت دەوێت؟ بەڕاشكاوی پێم بڵێن. دڵنیابن ئەگەر بتوانم ئەنجامیبدەم، ئەوكارەتان بۆ دەكەم. ئەگەریش نەتوانم، ئەوا ناتوانم و كارەكەتان بۆ ناكەم! تەنها لەژێر سێبەری پەیوەندیگەلێكی ڕاشكاو و ڕون و ڕاستگۆیانەی لەمشێوەیەدایە كە ئێمە دەتوانین دەست بەكاتەوە بگرین، دەتوانین لەیەك ڕۆژدا چەندین بەرنامە ئامادە بكەین، دەتوانین لەیەك ڕۆژدا چەندین بڕیار بدەین. یاخود لە یەك ڕۆژدا چەندین بابەت بگەیەنینە ئەنجام.

***

ڕاهێنان بکەن، ڕاهێنان لەسەر پەیوەندی ڕاشکاو، ڕۆشن و کاریگەر. باوەڕ بکەن ئەوەندە کاتی زیادەتان بۆ دەمێنێنەوە کە دەتوانن کارانێکی بەسودتریش ئەنجامبدەن. دەتوانن لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانتاندا بچن بۆ پارك، سینەما، یاخود گەشت و سەفەر. چونکە کاتتان هەیە. کات تاکە سەرمایەیەکە کە تێپەڕی ناتوانین بەهیچ شێوەیەك بیگێڕینەوە. ئەوە تەمەنی ئێمەیە. ئەگەر ماندو بیت، کاتێك خەوتیت شەحن دەبیتەوە. ئەگەر برسی بیت، کاتێك نان بخۆیت، دیسانەوە شەحن دەبیتەوە. بەڵام ئادەی بزانم چی لەکاتی خۆت دەکەیت کە تێپەڕی؟ ئەگەر بیرێکی هەڵەت کردبێتەوە، دەتوانیت داوای لێبوردن یاخود قەرەبوی بکەیتەوە، بەڵام کاتەکانت کە تێپەڕین دەتوانیت چیان لێبکەیت؟

***

ئێمە کە لە چوارچێوەی گەشەکردنداین و ئەمانەوێت گەشە بکەین و بەرەوپێشەوە بچین، ئەگەر گریمانی ئەوە بکەن کە بەیەك پیشەسازی و ئابوری، دە ساڵ مەودامان هەیە، پێش هەموو شتێك پێویست ناکات، کە دە ساڵیش ڕابکەین، چونکە تاوەکو دە ساڵیتر دیسانەوە ئەوان گەیشتون بە جێگەیەکیتر و ڕەوەندیان گۆڕدراوە. دووەمیش، پێویست ناکات ئێمەش بە هەمان ئەو ڕێگەیەدا بڕۆین. تەنانەت دەتوانین داهێنان بکەین. بۆ ئەمکارەش دەبێت (خێرا) بکەین. ئێوە سەیری فیلمەکانی وڵاتە پیشەسازییەکان بکەن. هەمیشە ڕیتمەکانیان توندن. هەمیشە کۆمەڵێك دیمەنی جیاواز دێن و

بینەر بەردەوام گیرۆدەیە. نەوەك لەبەر ئەوەی کە دەرهێنەر ئەمجۆرە تەدبیرەی هەیە. بەڵکو ئەمە خۆی ڕیتمی توندی ژیانە. ئەگەر بێت و ئەو ڕیتمەی خاو بکاتەوە، ئەوکات حەوسەڵەی بینەر بەسەر دەچێت، ئێمە ئەگەر بەرنامەیەکمان هەیە، دەبێت بەخێراییەوە پەیامەکەمان بگەیەنین. من هەوڵدەدەم لە چەند لاپەڕەدا بابەتەکانم بە ئێوە بگەیەنم، دەکرێت هەر ئەم بابەتە لە ٢٠ لاپەڕەشدا بگوترێت، ئەگەر بکرێت لە دوو لاپەڕەدا باسبکرێت، ئەوکات نابێت بە ئەندازەی سێ لاپەڕە درێژەی پێبدەین، بەڵکو دەبێت لەیەك لاپەڕەدا بیڵێین. ئەگەر لاپەڕەگەلێکی زیاترمان هەیە، ئەوکات بابەتەکان ڕادەهێنین و بابەتێکی نوێ باسدەکەین. بەڵام ئەوەمان لەبیر بێت کاتێك سەروکارتان لەگەڵ منداڵاندا هەیە، ئەوکات کات بەدەستی ئەوانە. مەبەست و ئامانجی کۆتایی بەدەستی ئەوانە. لەوێدا لەوانەیە باشتر وابێت کە خێرایی واز لێبهێنن. ڕێگە بدەن ئەوان قسەی خۆیان بکەن. ئەگەر بێت و لەگەڵ منداڵەکاندا کات بەسەر بەرن، دەبینن کە زۆر زوو ئەوان ڕازی دەبن. بەڵام هاوار بەماڵتان ئەگەر بتانەوێت کاتی دە خولەك کەم بکەنەوە بۆ پێنج خولەك، یان کاتی یەك سەعات بکەنەوە بە چارەکە سەعاتێك. دەبینن کە لەوانەیە دە بۆ یەك سەعات سەرف بکەن، بەڵام هێشتا منداڵەکە ڕازی نەبێت و هێشتا ئێوە گیرۆدەی ئەو منداڵە بن. ئەوەمان لەبیر بێت کە قاڵبێکی کاتی هەیە دەبێت لە پەیوەندییەکاندا دەرکی پێبکەین. نەمانەوێت کە هاوسەرەکەمان بە

هەمان ئەو خێراییەوە کە من ئەمەوێت، بابەتەکە وەربگرێت. ئەگەر پێویست دەکات دووبارەی بکەنەوە. ئەمە لەو لایەنەوە دەڵێم کە ئەو قسانەی لە خزمەتتاندا عەرزم کردن خراپتێگەیشتن دروست نەکەن.

(ڕوونی) جیاوەزە لە (خێرایی). پەیامەکەتان بە ڕوونی و ڕۆشنی بڵێن و ڕێگە بدەن لایەنی بەرامبەر لە مەبەستی ئێوە تێبگات و لەگەڵ ئەوەشدا پرسیاری لێبکەن کە (ئایا توانیم مەبەستەکەم بگەیەنم؟) نەوەك لێی بپرسن (تێگەیشتی چی دەڵێم؟) نەخێر، ئەرکی منی گۆیایە دڵنیاببمەوە کە بابەتەکەم بە باشی گەیشتبێت بە ئێوە. ئەگەر ئێوە لە بابەتێك تێنەگەیشتون، ئیتر من باشم گوتوە یان خراپم گوتوە، لە کاتێکی خراپدا گوتومە. بۆ نمونە ئێوە ماندون و منیش خەریکم قسەتان لەگەڵدا دەکەن. با هەمیشە ئەرك و لێپرسراویەتی قبوڵبکەین و بپرسین کە ئایا توانیومانە مەبەستەکەمان بگەیەنین؟ سوپاستان دەکەم، قۆناغی دواتر. دڵنیام کە بەیارمەتی یەکتری، پێشکەوتنە دە ساڵە و پازدە ساڵەکان لەماوەی سێ بۆ چوار ساڵدا ئەنجام دەدەین. ئەمکارەش دەکرێت ئەنجامبدرێت، بەومەرجەی کە سەرەتا ئاگاداری مەسەلەکە بین. دواتریش کۆمەڵێك پسپۆڕ هەن کە ڕێکارگەلێکمان نیشان دەدەن، ئێمەش دەبێت لە بونی ئەوان سود و بەهرە وەربگرین، بۆ ئەوەی خێزانێکی شادتر و ئێرانێکی ئاوەدانتر و ئابورییەکی پڕ ڕەونەقترمام هەبێت. ئەمەش بەیارمەتی یەکتری دەبێت.

# لیستی کڕینتان ئامادە کردووە؟

ئەمە پرسیارێکە من لە زۆرێك لە ئازیزان و دۆستان بەتایبەت خاتونەکانی دەکەم. ئێوە کاتێك لەماڵەوە دەچنە دەرەوە بۆ ئەوەی شت بکڕن، سەرەتا چ شتێك ئامادە دەکەن؟ بەڵێ، لیستی ئەو شتانەی کە ئەمانەوێت بیانکڕین. تاوەکو ئێستە ڕویداوە کە بچن بۆ شت کڕین، بەڵام لیستێکتان لەگەڵ خۆتاندا نەبردبێت، یاخود لەبیرتان چوبێت کە لیستەکە ببەن؟ چی ڕویداوە؟ بەڵێ ئەوە ڕاستە. تەقریبەن هەموشتێکتان کڕیوە بێجگە ئەو شتەی کە لە لیستەکەدا یاداشتتان کردبوو پێویستتان بوو! ئێستە با بزانین پێشنیاری من بۆ ئێوە چییە؟

***

تکادەکەم هەمو بەیانیەك کە لە خەو هەڵدەستن، بە ژیان بڵێن کە ئەمڕۆ چیتان لەم فرۆشگا گەورە جیهانیە دەوێت. بۆ ئەوەی کە لەبیرتان نەچێتەوە لاپەڕەیەك کاغەز و قەڵەمێك هەڵگرن و بنوسن بۆ نمونە: (من ئەمڕۆکە خۆشبەختی -لەگەڵ شەرحی خۆشبەختی، بۆ نمونە تەندروستی، خۆشحاڵ بون، تەندروستی و سەلامەتی هاوسەر و منداڵ، ئەوەی کە بتوانم بەسود و کاریگەر بم، سەروەت و سامان و

فەرعانە– دەخەمە ناو لیستی خواست و داواکارییەکانمەوە). هەموو ڕۆژێك کە لە خەو هەڵدەستن، چاوێك بە لیستەکەدا بخشێننەوە. حەزتان لە هەرچییەك هەیە بینوسن. چەندە باشە کە شەوی پێشو ئەم لیستەتان ئامادە کردبێت و بەیانی پێیدا بچنەوە، ئەگەر شتێکتان لەبیر چووە بینوسن. لە بەیانیەوە کە دەچنە ناو فرۆشگای ژیانەوە، بەم لیستەوە بچنە ژورەوە، لیستی کڕینەکەشتان لەگەڵ خۆتان ببەن.

***

بەڵام دەبێت ئەوەش بزانن کە لەکڕیندا کۆمەڵێك یاسا فەرمانڕەوایە. یەکەمیان ئەوەی کە ئەگەر ئێوە لەبیرتان بچێتەوە لیستەکە لەگەڵ خۆتاندا ببەن، ئەوکات هەموو شتێك دەکڕن، بێجگە لەوشتانەی کە پێویستتانە! بۆچی؟ چونکە ئەو کەسانەی کە فرۆشگاکە تۆمار دەکەن و کاسبکارە زیرەکەکان کاڵا و شتومەکەکان دەخەنە شوێنێکەوە بۆ ئەوەی ئیوەی کڕیار بەباشی بیانبینن و دواتر بیانکڕن. کاتێك دەچنە ناو فرۆشگاوە، ئەو فرشگایە ئەرکە لەسەری ئەو کاڵایانەی کە هەیەتی بە ئێوەەی بفرۆشێت، هەربۆیە ئەم شتومەك و کاڵایانە بەجۆرێك هەڵدەچنێت و ڕیزیان دەکات کە چاوی ئێوە بەباشی بیانبینێت و چاوتان پێیان بکەوێت.

***

ئەگەر بەبێ لیستی کڕین بچنە ناو فرۆشگای ژیانەوە، ئەوکات ڕەوتەکانی ژیان، ئێوە بەڕێوە دەبەن. شەپۆلی ژیان ئێوە بەملا و

ئەولادا دەبات. بە بیستنی هەواڵێك یاخود گۆرانی یاسایەك لەوانەیە ژیانتان بشێوێت. ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەیە کە لیستتان لەگەڵ خۆتاندا نەبردووە. من زۆربەی سەرکەوتنەکانی ژیانم بەناو قەیرانەکاندا بەدەست هێناوە. ئەمە لەکاتێکدایە کە هاوڕێ و هاوکارانمان لەژێر فشاردا بوون، ئێمە سەرکەتو بوین. دەزانن بۆچی؟ چونکە من لەهەر هەلومەرجێکدا لیستی فرۆشگای ژیانم پێبوە، هەربۆیە سەرکەتوو سەرکەوتوتر دەبوم و ئەو گۆڕانکارییانەم بۆ بەرژەوەندی خۆم دەقۆستەوە.

***

ئەوەتان لەبیر بێت کە ئەگەر لیست لەگەڵ خۆتاندا نەبەن، ئەو شتەی کە زیادە لەلایان، یاخود ئەوشتەی کە قازانجێکی زۆری لێدەکەن، دەیفرۆشن بە ئێوە، نەوەك ئەو شتەی کە ئێوە پێویستتانە.کاتێك دێیتەوە دەبینیت پارە و کاتی خۆتت خەرج کردووە و لەگەڵ خەرمانێك لە شتومەك و کالاّدا ڕوبەڕو دەبیتەوە کە هیچکامیانت پێویست نییە و تەنانەت بە کەڵکیشت نایەن!

***

پێشنیاری من لەم بوارەدا زۆر سادە و ئاسانە: با لیست ئامادە بکەین و منداڵەکانیشمان فێر بکەین کە چۆن لە فرۆشگای ژیاندا شتومەك و کالاّی باش و پێویست بۆ خۆشەبختی و بەختەوەری ژیانی ڕۆژانەیان بکڕن!

***

ئێستە پرسیارێك دێتە پێشەوە. یەكێك لە خاتونەكان بە منی گوت: (باشە من لەبەر خۆمەوە دەڵێم ئەمڕۆ ڕۆژێكی زۆر باشە. من شادومان و تەندروستم و ئەمجۆرە قسانە. بەڵام هیچ هەواڵێكی خۆشم پێنەگات و شادومان نەبم. ئەوكات چی بكەم؟ ئایا لەمشێوەیەدا نابێت لیستی كڕین ببەین بۆ فرۆشگا؟) وەڵامی منیش ئەمەیە (نەخێر، دیسانەوە دەبێت لیست بنوسنەوە). من بەمجۆرە شەرحم كرد بۆ ئەو خاتونە:

ئێوە دەچن بۆ شت كڕین و لیستی كڕینەكەتان لەگەڵ خۆتاندا دەبەن. دەچن و لە فرۆشگایەكدا بۆ نمونە داوای ماست لە فرۆشیارەكە دەكەن، دەتانەوێت بیكڕن، بەڵام ئەو دەڵێت نیمانە. تەواو بووە. ئایا لەم حاڵەتەدا ئێوە كەسێكی بێشانسن، ئایا ئەو ڕۆژە، ڕۆژێكی باش نییە؟ نەخێر ئەمە وانییە. لەكاتێكدا ئەو كاڵایەتان پێ نییە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە. لە ماڵەوە لیستێكی نوێ ئامادە دەكەن، لەناو ئەم لیستەدا ئەو كالایەی كە نەتانتوانیبو بیكڕن، دیسانەوە لەناو لیستە نوێیەكەدا دەینوسنەوە. بۆ ژیانیش هەربەمشێوەیە. ڕۆژێك دێت ئەوەندەی كە چاوەڕێتان دەكرد، شاد یاخود سەركەوتو نەبون. باشە. ئەمڕۆ فرۆشگای ژیان ئەو كاڵایەی كەم بووە یاخود هەر نەیبوە. باشە بەیانی بیكڕن! بیخەنە ناو لیستی بەیانیتانەوە. بەڵام وریابن و هەرگیز بەبێ لیست نەچن بۆ شت كڕین. چونكە هەموو شتێك دەكڕن، بێجگە لەوەی كە پێویستتانە.

***

ئەگەر لە ژیاندا بەبێ ئامانج بن، ئەوکات هەموو کەسێك دەتوانێت ئێوە بەرەو هەرشوێنێك ڕاپێچ بکات کە حەزی لێیەتی. هەموو کەسێك دەتوانێت لە مەسیری ژیان لامان بدات، هەر هەواڵێك دەتوانێت ئاوەژومان بکاتەوە. بەڵام کاتێك ئێوە ئامانج و بەرنامە و لیستتان هەیە، ئەوکات ئەوە ئێوەن کە هەڵدەبژێرن. ژیان بریتیە لە فرۆشگایەکی گەورە، کە هەرچیەکت بوێت، پێتی دەدات، بەومەرجەی کە (ئامادەبیت بەهاو نرخەکەی بدەیت) منیش عەرزی ئێوە دەکەم کە نرخەکەی زۆر هەرزانە: پێڕستێك لە پێداویستیەکان، هەربۆیە بەرنامەڕێژی و ئامانج دانان نرخ و بەهای خۆی هەیە. ئەو کەسەی کە ئامانجی هەیە و بەرنامەڕێژی دەکات، بەپێی یاسای چاوەڕوانی دەڵێت کە چی دەوێت. بۆ نمونە دەڵێت ئەمڕۆ ئەمەوێت وەرزش بکەم، شت بکڕم، بچم و سەردانی فلانەکەسم بکەم، کتێبێك بخوێنمەوە و...هتد هەموو ئەمانە دەنوسێت. ئەمە بریتیە لە لیستی کڕینی ئەم کەسە لە ژیان. بەڵام نەگونجاوە کە بەبێ بەرنامە کارێك بکەن و شتێکی زۆر گرانبەهاتان دەستبکەوێت. نەوەك لەبەر ئەوەی کە نییە، بەڵکو هەیە، بەڵام ئێوە نازانن کە دەبێت ئەو شتە هەڵبگرن و بیکڕن. کاتێك دەچن بۆ زنجیرە مارکێت و فرۆشگا گەورەکان، هەموو شتێك هەیە. لە فرۆشگای ژیاندا، ئێوە سەروەت و سامانی بێبن و فراوانتان هەیە، بەڵام کاتێك کە خۆتان نەتانەوێت هەرگیز بەدەستی ناهێنن. هەرچیەکتان بوێت بە ئێوەی دەدات،

ئەگەریش ناتانەوێت، ئەوە هۆکارەکەی باوەڕی ئێوە و ئامادە نەبون و بەرنامەڕێژی نەکردنی ئێوەیە.

***

بێزەحمەت هەر لە ئێستەوە قەڵەم و کاغەزێك هەڵگرن و دەستبکەن بە نوسین. تەنانەت بۆ ساڵی داهاتویش بنوسن. ئەوە بنوسن کە تاوەکو فلاّنەساڵ ئەمەوێت فلاّنەکار ئەنجام بدەم. لە سیمیناری (سەرکەوتن)یشدا گوتومە، کە ئەم سەرکەوتنەیش پێویستی بەکات هەیە. ئەوە بیرو زەینی ئێمەیە کە دەبێت باوەڕی بەسەرکەوتن هەبێت. ئەمەیە کە کات دەبات و پێویستی بە کاتە. کاتێك باوەڕتان کرد، ئەوکات دەبینن کە لەبن دەستتاندایە.

سالها دل طلب جام جم از ما می کرد

ان چه خود داشت ز بیگانه تمنا می کرد

واتە: ساڵانێك دڵ داوای جامی جەمی دەکرد. ئەوەی کە خۆی هەیبوو تەمەننا و داوای لە بێگانە دەکرد.

ئەمە یانی چی؟

اب در کوزه و ما تشنه لبان می گردیم

یار در خانه و ما گرد جهان می گردیم

واتە: ئاو لە ناو گۆزەکەدایە و ئێمەش بە لێوی تینوەوە دەگەڕێین. یار لەناو ماڵەوە و ئێمەش چواردەوری دونیای بۆ دەگەڕێین.

زۆرە و زۆر فراوانیشە ! بەڵام دەبێت یار و ئاو بناسین، بۆ ئەوەی کاتێك بینیمان هەڵیبگرین. نابێت ئاوی سوێر هەڵبگرین. بەڵکو دەبێت ئاوی شیرین و خۆشڕەو لە گەرو هەڵبگرین. یار بناسینەوە کاتێك بینیمان. سڵاوی لێبکەین و بەرەو پیری بچین.

***

دەبێت بەرنامەمان بۆ کاتژمێر، ڕۆژ، هەفتە، مانگ و تەنانەت ساڵ هەبێت، بەرنامە دورمەوداکان گشتیترن و بەرنامەکانی بەیانی ناگشتیترن. بەڵام دەبێت بزانن کە لە هەفتەی داهاتودا چاوەڕوانی چ سەرکەوتنێك دەکەن. کاتێك لیستت هەیە، بەیانی کە لەخەو هەڵدەستیت، دەزانی چیت دەوێت. دەچیت بۆ لای ئەو ڕەفە و چەکمەجانەی کە جێگەی مەبستن و ئەوەی کە پێویستت پێی هەیە هەڵیدەگریت و بەکارەکانتدا ڕادەگەیت. بەڵام کاتێك لیستت نییە، هەموو فرۆشگاکان دەچیت و لە کۆتاییشدا بە دەستی خاڵی دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە و ئەوشتەی کە ویستوتە نەتکڕیوە و کاتەکەیشت بە فیڕۆداوە و هەلەکەیشت لەدەستچووە. ئەمەش نەوەك لەبەر ئەوەی کە تۆ مرۆڤێکی نەشیاوی بۆ گەیشتن بە بەختەوەری، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لیستەکەی خۆتت ئامادە نەکردوە.

***

ئیوەش خوێنەری ئازیز و بەڕێز و خۆشەویست، ئایا هەر لە ئێستەوە بۆ ئامادەکردنی لیستی خواستەکانت لە ژیان دەستپێشخەری دەکەیت؟

## چۆن ئەندازیاری ژیانی خۆتان بن؟

ماوەیەك لەمەوبەر لەگەڵ یەكێك لە ئەندازیارەكاندا لەمبارەیەوە قسەو باسم دەكرد كە ئەگەر بمانەوێت موڵكێك كە من هەمە، دروستیبكەم، چەندی تێدەچێت و چ هەلومەرجگەلێكی هەیە. یەكێك لە قسەكانی ئەو ئەندازیارە بەڕێزە ئەوەبوو كە دەپرسێت: (ئێوە پەیكەرە و پایەی چیمەنتۆتان دەوێت یان ئاسنین؟) منیش جیاوازی و تایبەتمەندی و كەموكوڕی هەریەكەیانم لەناو براو پرسی. بەڵام ئەو شتەی كە بەلامەوە سەرنجڕاكێش بوو، كە لە هەرحاڵەتیكدا بێت خانوو باڵەخانە پایە و پەیكەرەی دەوێت. هەموو جوانیەكانی دەرەوە و مۆبێلیات و نەخشە و ڕەنگ و تاقمەكان، هەر هەمویان لەسەر كۆمەڵێك پایە و پەیكەرەیەك وەستاون. ئەم پەیكەر و پایانە دەكرێت لە داریش بن، بەڵام دەبێت پایە و پەیكەرەیەك بوونی هەبێت. با بزانین لەناو ڕۆح و دەرونی ئێمەدا ئەم پەیكەرە و پایانە چین؟ لەناو جەستەی ئێمەدا یەك پەیكەرەمان هەیە، ئەویش ئەو ئێسقانانەن كە بەهۆی ماسولكە و جومگەكانەوە لكاون بەیەكتریدا، ئەم مرۆڤەی كە دەیبینین و چێژی لێوەر دەگرین و خۆشمان دەوێت، لەو ئێسقانانە پێكهاتووە. ئیسقانگەلێك كە ئەگەر نەبن ئەوا

بەشەکانیتری ڕواڵەتی مرۆڤ دەڕوخێن و تێکدەچن و هەرەس دەهێنن. دەبێتە شتێکی بێمانا و خراپ و تامڵ نەکراو. لەڕوی دەرونیشەوە ئێسکەپەیکەرمان هەیە. ئیسکەپەیکەرێك کە ئەگەر بەهێز بێت ئێمە قەد و قامەتمان ڕاست و ڕێك دەبێت، خۆشبەخت دەبین، شادی و خۆشبەختی و بەختەوەری ئەزمون دەکەین. بەڵام بابزانین بەشەکانی ئەم ئێسکەپەیکەرە چین؟ بەشەکانی ئەم ئێسکە پەیکەرە کۆنکرێتی یان ئاسنینە کامانەن؟

***

لە دەروونناسیدا، بەم ئێسکەپەیکەرە دەرونیە دەڵێن (سیستەمی بەهایی). واتە من و ئێوە وەك مرۆڤ، چ شتانێك بۆ خۆمان بە بەها و چ شتانێکیش بە دژە بەهایی دەزانین. بۆ نمونە کەسێك کە بەڕێز و خاوەنی متمانەیە و خەڵکی خۆشیان دەوێت و متمانەی پێدەکەن، سیستەمێکی بەهایی جیاوازی هەیە لەگەڵ کەسێکدا کە بێ متمانە و قەرزدارە و کێشەی هەیە. نەوەك کەسێك باشتر بێت لەویتر. هەریەکەیان ئەوە دروێنە دەکەنەوە کە چاندویانە. هەردوکیان مرۆڤن. بەڵام لەئێسکەپەیکەری دەرونیاندا جیاوازییان هەیە.

***

ئێستە لەسەر بنەمای ئەم سیستەمە بەهاییە، ئێمە ڕەفتارگەلێکی جیاواز لە خۆمان نیشان دەدەین و کاردانەوە و فیکر و هەستمان دەگۆڕدرێت. کەسێك کە سیستەمی بەهایی ئەوە بێت کە ئەگەر ئەمڕۆ نەکرا ئەوا با بەیانی، چ پەلەیەکم هەیە؟ ئەوە کەی گرنگە؟

کەسێکی لەمجۆرە هەرگیز نابێتە خاوەنی هیچ شتێك. کەسێك کە لە سیستەمی بەهایی خۆیدا پارە شتێکی ناشیرین و پەست و نالەبارە، هەرگیز نابێتە خاوەنی پارە. نەوەك ئەوەی کە بڵێین مرۆڤێکی خراپە، یان کەسێکی نەشیاوە، ئەم سیستەمە بەهاییە ڕێگە بەو نادات کە ببێتە کەسێکی پارەدار. واتە ئێسکەپەیکەری دەرونی ئەم کەسە ئێسکەپەیکەرێك نییە کە بتوانرێت پایە و کۆڵەکەکانی ئەم بینایەی لەسەر دروستبکرێت.

***

هەروەها بەپێچەوانەیشەوە، کەسێك کە دەڵێت: (ماڵی خەڵکی ماڵی خەڵکییەو و لەلای من ئەمانەتە و دەبێت بۆیانی بگێڕینەوە. ئەگەر زیانێکمان داوە دەبێت قەرەبوی بکەینەوە. ئەگەر پارەمان قەرز کردووە دەبێت لەکاتی خۆیدا بیگێڕینەوە. خاوەنی وادە و پەیمان و قسەی خۆمان بین. مرۆڤ وەك مرۆڤبونەکەی بونەوەرێکی بەرێزە). سیستەمە بەهاییەکەیەتی کە دەبێتە هۆی گەشە و خۆشبەختیەکەی. یەکێك لەو سیستەمانەش ئەمەیە کە من و ئێوە چۆن بیر لە خۆمام دەکەینەوە؟ چەندێك ئێمە خۆمان بەو ئەندازەی کە هەین قبوڵ دەکەین؟ چەندە خۆمان خۆشدەوێت و چەندێك ڕێز لە خۆمان دەگرین؟ لە ناخ و دەرونەوە دەگەڕێین بەشوێن ڕێز و ئیحتیرامی خۆماندا، یاخود لە ڕەفتارەکان، یان لە دەرئەنجامەکاندا؟ یاخود لە پشتگیری کردنی خەڵکانیترەوە؟ ئەمەش دیسانەوە دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی بەهایی ئێمە.

***

مۆڵەتم بدەن لەداستانێکدا ئەمەتان بۆ بگێڕمەوە. من بۆ ماوەیەك و بە بۆنەیەکەوە لەماڵی یەکێك لە ئازیزانمدا مابومەوە. هاوین بوو ماڵەکەش مێشولەی زۆری هەبوو، ئێوەش دەزانن کە مێشولەکان هەر چەند ڕۆژ جارێك کتوپڕ زۆر دەبن. چونکە بەخێرایی زاوزێ دەکەن. هەر دوو هەفتە بۆ سێ هەفتە یەکجار، ئەو ماڵە پڕ دەبوو لە مێشوولە و لە شەودا بەهیچ شێوەیەك شیاوی پشودان و مانەوە نەبوو. بەجۆرێك کار گەیشتبویە ئەوەی کە من بۆ کچە بچوکەکەم پەردەکوللەیەکم دروستکردبوو، بۆ خۆشمان دەرمانی دژە مێشولەمان لە جەستەمان دەدا، لەوکاتەدا کە من بە خاوەنی ماڵەکەم گوت ئایا مێشولەکان ئازاری ئێوە نادەن؟ ئەویش لەوەڵامدا گوتی بەدەست مێشولەوە تەواو بێزار بون و ئارامی و ئیسراحەتیان نەماوە. منیش گوتم: دەرمان بوەشێنن، ئەویش گوتی بەڵێ دەبێت دەرمان بوەشێنین، بەڵام ئەوکارەیان نەکرد. سەیر ئەوەبوو لەوماوەیەی کە من لەوێ بووم، چەندینجار نەخشەی لەزگەی دیوار و ڕەنگی دیوارەکان و تاقمی توالیتەکەیان گۆڕی، منیش لە خۆمم دەپرسی باشە ئەمانە بۆچی ئەم هەموو خەرجە دەکەن؟ خۆ ئەم بەلوعەیە ئیش دەکات و عەیبی نییە، بەڵام باشە بۆنمونە بۆچی ١٥٠٠٠ هەزار تمەن لە دەرمان وەشاندنی چاڵ و گۆماوەکاندا سەرف ناکەن؟ تەنانەت ئێمە لەناو ڕۆژنامەدا شوێنێکمان بۆ دۆزینەوە کە دەتوانن تەلەفۆنیان بۆ بکەن و بانگیان بکەن بۆ ئەوەی دەرمانیان

بۆ بوەشێنن. تاوەکو ئێستایش و ئەوەی کە من ئاگادارم هێشتا دەرمانی مێشولەیان لەو شوێنەدا نەوەشاندوە. بەڵام هەر ماوەیەک جارێك بەردی مەڕمەڕی ماڵەکە، کابینەکانی چێشتخانەکە، بەلوعە و خەڵاتەکانی تواليت و گەرماوەکە و نەخش و نیگاری ماڵەکە و لەزگەی دیوارەکەیان ساڵانە نوێ دەکەنەوە. هەموو ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی بەهایی. بۆ ئاسایشی خۆیان وەك مرۆڤ کات و پارەیەکی زۆر خەرج ناکەن. بەڵام بۆ ئەوەی کە ماڵەکەیان بە شێوەیەکی تایبەت کە ئەوان پێیانوایە جوان دەبێت، بۆ ئەوەی ئەگەر دراوسێیەك یاخود دۆست و هاوڕێیەك هات، بیبینێت و ئافەرینیان بکات و بڵێت جوانە- کات و پارە خەرج دەکەن.

***

لەوانەیە بۆ پەروەردە و فێکردنی خۆمان پارە خەرج نەکەین، بەڵام لەوانەیە دەعوەتی و میوانی ڕێکبخەین و چەند ملیۆن تمەن لەوپێناوەدا خەرج بکەین. ئەوکات لەبری کڕین بەرنامەیەکی فێرکاری کۆپی بکەین. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی بەهاییمان. ئەوەمان بیر دەچێتەوە کە کۆپی کردنی سیدیەك وەك ئەوە وایە کە دەستبکەیت بە گیرفانی خەڵکیدا. ئەم سیدیە یان ئەم بەرنامە فێرکارییە، مافی لەبەرگرتنەوەی بۆ کۆمەڵە یان دەزگا یاخود ڕێکخراوێك پارێزراوە، کە بەدییان هێناوە، کاتێك کۆپی ناکەین کە سیستەمی بەهایی پەیوەندیدارمان هەبێت. باشە من چۆن دەتوانم خۆشبەخت بم؟ ئایا دەبێت بڕۆم و وانەی خۆشبەختی و

بەختەوەری بخوێنم، ئەویش لەڕێگەی کۆپی کردنەوە؟ بۆ نمونە سیدیەك کۆپی بکەم بۆ ئەوەی بە هەرزانتر لەسەر بکەوێت و بە بیستنی خۆشبەخت ببم؟ ئەمە بەهیچ شێوەیەك نابێت. ئەو سیستەمە بەهاییە کە من والێدەکات و ناچارم دەکات کە کارێکی لەمشێوەیە بکەم، هەرگیز ناهێڵێت من بەختەوەر ببم. هەربۆیە دەبێت ئەم سیستەمە بگۆڕدرێت.

***

با بەیەکجاری بگەڕێینەوە ببینە ئەندازیاری ژیانی خۆمان و سەر لەنوێ خانوو باڵەخانەی ڕۆحمان دروستبکەینەوە. باسی ئەوە بکەین کە چ ئێسکەپەیکەرێکی بۆ دابنێین. چ شتانێکی بەهایی هەیە کە لەسەر بنەمایان دەتوانم بەباشی بژیم. دەتوانم هاوشارییەکی باشتر یاخود بەندەیەکی باشتری خودا بم، دراوسێیەکی بەڕێزتر بم. منداڵێکی باشتر پەروەردە بکەم. ئەگەر بیانگۆڕین و ڕاستیان بکەینەوە، ئەوانیتر خۆیان باش دەبن. پێویست ناکات بەزۆر بلکێین بە شتێکەوە وە پێمانوابێت کە بەو شێوەیە دەگۆڕدرێت. نەخێر ناگۆڕدێت. دەبێت سیستەمە بەهاییەکانمان بەباشی بناسین. هەندێك سیستەم کە ئێستە هەمانە زۆر باش و بەنرخ و بەهان و دەبێن بیانپارێزین. بەڵام ئەو باوەڕو و بەهایانەی کە ئێمە لە ژیان دوادەکەخەن و دەبنە ڕێگر لەبەردەم تەندروستی و ڕۆحی و جەستەییماندا، پێویستە لایان ببەین و هەوڵ بدەین لە ئێسکەپەیکەرماندا کەموکوڕییەك نەبێت. ئەوکات وەك خانویەکی

بەرزی ٣٠ بۆ ٤٠ قات یاخود ١٠٠ قات (پەیوەندی بە پێکهاتەی پایە و پەیکەرەکانیەوە هەیە) دروستبکەن و بەرز ببنەوە و بچنە سەرەوە. مرۆڤ گەشە دەکات، بەلاّم لەسەر بناغە و پایە و کۆڵەکەی ڕاست و دروست.

***

هەرچیەك هەیە لەسەر بنەما ڕاست و دروستەکانە و دونیا لەسەر بنەماو بناغەی ئەم بەهایانە دەسوڕێت. وەرن بایارمەتی یەکتری بدەین و دووبارە ژیانمان بکەینەوە بە ژیانێکی ئەندازیارانە. پەیکەرە و پایەی بەهێز دروستبکەین، بۆ ئەوەی بتوانین کۆشکی بەختەوەریمانیان لەسەر دروستبکەین. هەروەك خاتونە شاعیر (پەروینی ئیعتیصامی) دەڵێت: (هەوڵی تۆی وەستای بەختەوەری بیناکەیە!).

## "مۆرك" له خۆت مەده

لەو تێکەڵی و مامەڵانەی کە لەگەڵ ئێوەی ئازیزاندا هەمە و پرسیارم لێدەکەن و هەندێك دەتانەوێت بیرو بۆچونی من بزانن، خاڵێکم بۆ دەرکەوتوە، خاڵێك کە لە کۆنەوە ڕەگ و ڕیشەکانیم لەدەوروبەرەکانی خۆمدا بینیوە، ئەویش بریتیە لە (مۆرك لێدان) مرۆڤەکان بۆ ئەوەی کاری سادە ئەنجامبدەن، ڕیزبەندی دەکەن و دەڵێن کە بۆ نمونە ئەسفەهانیەکان فلأنە شتن، شیرازییەکان و ڕەشتیەکان و...هتد بەمشێوەیەن. تارانیەکان بەمشێوەیەن و بیانیەکان بەوجۆرەن و موسوڵمانەکان و مەسیحیەکانیش بەمشێوەیەن. ئەمانە لەگەڵ ئەوەی کە یەك مانا و چەمکی گشتی هەیە، ئەوا وەك پێویست ڕاست نییە و ڕێگەیەکە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان و کورتکردنەوە لە بیر و زەیندا، کە ئەگەر بمانەوێت داوەری بکەین، دەبێت بزانین کە بۆ نمونە دەبێت ڕەچاوی ئەم بنەمایانە بکەین. بەڵام ئەم سادە ڕوانینە نابێت وامان لێبکات کە ژیانمان خراپ ببێت.

***

یەکێك لەم سادە ڕوانینانە بریتیە لە مۆرك لێدان، بۆ نمونە هەندێك دەڵێن: من حەسودم و ئیرەیی بە خەڵکی دەبەم. هەندێك دەڵێن من پاشملە و غەیبەتی زۆر دەکەم، ڕقم لە خۆمە. یەکێکیتر دەڵێت من زۆر هات و هاوار دەکەم و هەرچیەك دەکەم ناتوانم پێشی خۆم بگرم و خۆم کۆنترۆڵ بکەم. هەندێکیش دەڵێن من کەسێکی خەجاڵەتی و شەرمنم، کاتێك ئەمەوێت قسە بکەم ناتوانم، بەڵام کاتێك لەلای ئەو کەسە دەڕۆم، هەموو ئەو قسانەم دێتەوە یاد و بەخۆم دەڵێم دەبوایە ئەمەت بگوتایە و ئەوەت بگوتایە، بەخۆم دەڵێم بێ غیرەت بۆچی وەڵامت نەدایەوە.... لەگەڵ خۆمدا خراپ دەبم و زۆرێك لەم مەسەلانە کە دەزانم ئێوە لە خۆتان یان لە خەڵکانیتردا شکیان دەبەن و دەیانبینن و یاخود بەباشی هەستیان پێدەکەن.

***

نمونەیەك دەهێنمەوە. تەسەوری بکەن کۆمەڵێك دەفر و قاپتان لە چێشتخانەدا هەیە، کە شەکر و خوێ و بیبەریان تێدەکەن. لەسەر دەفرێکیان بنوسن شەکر، شەکری ناو ئەم قاپ و دەفرە تەواو دەبێت و هێشتا مۆرك و قاغەزەکەی لەسەر ماوە. ڕۆژێك خوێ دەکڕن و دەیکەنە ناو ئەو دەفرەوە کە ئەویش وەك خوێ سپیە، مۆرکێکی پێوەیە و نوسراوە شەکر، بۆ نمونە کەسێك شارەزای ماڵی ئێوە نییە، بەوکەسە دەڵێن، شەکرەکە بهێنە، ئەویش دەفر و قاپی خوێکە دەهێنێت و کاتێك دەیکەنە ناو چایی یان خواردنەکەوە، بە

کەڵکی خواردن نایەت، بۆچی؟ ئایا ئێوە خەتابار و کەمتەرخەمن؟ یان ئایا ئەو کەسە خەتابار و کەمتەرخەمە؟ لەم نێوەندەدا چی ڕویداوە؟ بەو کەسە دەڵێین کاکە من گوتم شەکرەکە بهێنە، تۆ خوێت هێناوە. ئەویش لەوەڵامدا و بۆ بەرگری لە خۆی دەڵێت ئێ باشە کاکە لەسەری نوسرابو شەکر، منیش هێنام.

***

ئێمەی مرۆڤ نەریتمان وایە کە مۆرک لە شتەکان بدەین، بۆ ئەوەی کارەکەمان سادە بکەینەوە، لەسەر ئەو مۆرکەمان داوەری دەکەین. دەڵێین ئەو مرۆڤێکی شیرینە، لەکاتێکدا کە سوێرە، هەروەها بەپێچەوانەشەوە دەڵێین ئەو مرۆڤێکی سوێرە، لەکاتێکدا کە کەسێکی شیرینە و بەیەك نیشانە هەموو ئەو کەسە دەخەینە ژێر پرسیارەوە. پرسیاری من ئەمەیە کە بۆچی مۆرك لە خۆتان دەدەن؟ باشە ئێوە دەڵێن من توڕەم، هات و هاوار دەکەم، من غەیبەت و پاشملە دەکەم و کەسێکی ئیرەبەر و حەسودم، ئایا ئەم ئەخلاقە باش و پەسەندیدەیە؟ بۆچی نەڵێین من توڕەم و فلانەکەس بێ ئەدەبە؟ دەڵێین ئەگەر حەز دەکەن ئەوا وەڵامەکە لە من ببیستن (کە پێموایە پێتان خۆش بێت) دەی کەوابوو بۆتان دەڵێم.

***

کاتێك مۆرك لە خۆتان دەدەن کە من کەسێکی بێ غیرەتم، تەمبەڵ و گەمژەم، بۆ نمونە بیرکاری نازانم و سەریش لە ژمێریاری دەرناکەم، کاتێك ئەم مۆرکانە لە خۆتان دەدەن، لە سیستەمی

مێشکی مرۆڤدا ئەم ڕوداوە ڕوودەدات: ئەمە (هەواڵ)ێك نییە کە بەخەڵکی بدەن، بەڵکو ئەمە (فەرمان)ێکە کە بەسەر خۆتاندا دەیدەن، کە بەڵێ من بیرکاری و ژمێریاری نازانم. ئەگەر منداڵێك بە خۆی بڵێت (گەمژە) هەر بەڕاستی گێژ دەبێت، چونکە ئەم فەرمانەی بە مێشکی خۆی داوە، پێشتر ئەوەم نوسی کە ئەگەر مرۆڤ بزانێت گەمژەیە، بەڕاستی مرۆڤێکی زۆر هۆشیار و زیرەکە. چونکە گەمژە نازانێت کە خۆی گەمژەیە. کێشەی ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ کەسێکی گەمژەدا ئەوەیە کە وادەزانێت هەموو شتێك دەزانێت، دەتوانێت وەڵامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە و لەناو ئەو دونیا بچوکەی خۆیدا هەموو وەسڵ و پسوڵەکانی هەیە. ئەم کەسە گەمژەیە، نەوەك کەسێك کە دەڵێت من کەسێکی گەمژە و گێلم. تۆ بێتواناو گەمژە نیت، بەڵکو مۆرکت لە خۆت داوە و هەروەك ئەو مۆرکەش هەڵسوکەوت دەکەیت. هەربۆیە هەرکەسێك بتبینێت دەڵێت تۆ کەسێکی گەمژەیت و هەر بەوجۆرەش هەڵسوکەوت و ڕەفتارت لەگەڵدا دەکات. (هیچ کەسێك منی خۆشناوێت و گرنگیەکی ئەوتۆم پێنادەن، کەوابوو من کەسێکی خۆشەویست نیم). کاتێك تۆ بەمجۆرە بیر دەکەیتەوە، مێشکیشت ئەم فەرمانە بەتۆ دەدات کە تۆ کەسێکی خۆشەویست نەبیت. هەربۆیە واز لە مۆرك لێدان لە خۆتان و بیرکردنەوەی سادە بهێنن.

***

ئێستە دەبێت چی بکەین؟ پێشنیاری من بۆ ئێوە ئەمەیە. بەبیری خۆتانی بهێننەوە کە ئیرەیی جۆرێکە لە (بەرگری دەرونی) واتە مێشکی ئێمە بۆ ئەوەی خۆی هاوسەنگ بکات، ئیرەیی دەبات، بابزانین چۆن؟ ئیرەیی هەر لەسەردەمی منداڵییەوە دێت. منداڵ بێتوانایە و کاتێك دەبینێت خوشك یان براکەی لەلایەن دایکوباوکیەوە زیاتر جێگەی بایەخە و خۆشەویستیەکی زیاتری پێدەدەن، هەست بە مەترسی دەکات. هەربۆیە لەگەڵ خوشك یان براکەیدا دەستەویەخە دەبنەوە و هاتە و هاوار بەرپێدەخەن. ئەمە بۆ منداڵ شتێکی زۆر سروشتیە. بەڵام ئەگەر ئەم منداڵە بە متمانەبەخۆبونەوە گەورە نەبێت و فیری نەکەن کە ئازیزەکەم تۆ جێگەی خۆت و بەشی خۆت هەیە و بیگەیەنن بە شوێنێك کە متمانەبەخۆبون پەیدا بکات و متمانەی بەخۆی هەبێت، توشی کێشە دەبێت. بەڵام بەداخەوە ئێمە زۆر گرنگی بەم مەسەلانە نادەین و منداڵەکەمان بە ڕۆحیەتێکی منداڵانەوە گەورە دەبێت و هێشتایش وابیر دەکاتەوە کە ئەگەر بوتڵێك ساردی یان خواردنێك خەڵکی بیخۆن هیچ بەری ئەم ناکەوێت، هەربۆیە هێرش بۆ خواردنەکان دەبات و بێتاقەتە بۆچی خەڵکانیتر دەیخۆن. بۆ نمونە ئەگەر کەسێك سەیارەیەکی کڕی، بێتاقەت دەبێت و وابیر دەکاتەوە کە ئیتر سەیارە بۆ ئەم ناکڕدرێت، یان ئەگەر کەسێك دەوڵەمەند بوو، وادەزانێت پارەکان تەواو دەبن و بەشی ئەو نامێنێت. لەمجۆرە شتانە زۆرن، هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە ئێمە بەشێوەیەکی سنوردار

بیردەکەینەوە و مۆرك لە خۆمان دەدەین. با بەشێوەیەکیتر بیر بکەینەوە و بڵێین خۆ من بەرگری دەرونیم هەیە و بەباشی فێری بوم، من بەجۆرێك تەسەور دەکەم و مێشکم گوتویەتی کە ئەگەر تۆ ئیرەیی ببەیت، هێمن دەبیتەوە. ئەمە (بەرگری دەرونی منە) . یاخود هات و هاوار دەکەم و بۆ ئەوەی کە بە خواست و ئارەزوەکەم بگەم، فێر بویت کە دوو لەقە بوەشێنیت کارەکەت مەیسەر دەبێت. هەموو ئەم شتانە (فێر بوم).

***

ئێستە خەڵوەت لەگەڵ خۆتدا بکە و بە بیرو زەینی خۆت بڵێ ئەم ڕێگەیەت گرتوەتەبەر و تاوەکو ئێستە کاری خۆی کردووە و ئەم زیانانەی بۆ من هەبوە، بەڵام من بێجگە لە هات و هاوار و شەڕ و ئاژاوە چ کارانێکیتر دەتوانم ئەنجامبدەن؟ مێشکی هۆشیاری تۆ ڕێگەکەت نیشان دەدات. بەرگری لە ڕێگەکەت مەکە و خەڵکی تۆمەتبار مەکە و پەنجەی تۆمەتیش بەرەو دایك و باوکت ڕامەکێشە کە ئەوان منیان خراپ پەروەردە کردوە. ئەرك و لێپرسراویەتی قبوڵ بکە و بڵێ من ئێستە دەبێت چی بکەم بۆ ئەوەی ڕەفتارێکی باشتر لە خۆم نیشانبدەم. هەر تەنها بەوەی کە پرسیار بکەیت، مێشکت دەچێت بەناو بیرو خەیاڵدا. خەوتویت، لە گەرماودایت و پیادەڕەوی دەکەیت، کتوپڕ دەڵێت ئەمکارە بکە و ئەوکارە ئەنجامبدە. خۆت و مێشکی خۆت فێر بکە. بە واتایەکیتر ئێستە ئەرك و لێپرسراویەتی قبوڵبکە، وەك ڕاهێنەرێك هەڵسوکەوت لەگەڵ خۆتدا بکە، ڕاهێنەری

خۆت و دایکوباوکی خۆت بە، سەر لەنوێ خۆت فێر بکەرەوە. لەبری ئەوەی کە شەڕ لەگەڵ خۆتدا بکەیت، خۆت فێر بکە کە کامە ڕێگە ڕاستە؟ ئەگەر لەگەل خۆتدا خراپ بیت، دەتەوێت ئەو کەسەی کە لەگەڵیدا خراپیت، واتە خۆت سزای خۆت دەدەیت و زیاتر ئەوکارەیش ئەنجامدەدەیت. هەرکاتێك کاری خراپت کرد و لە خۆت ناڕازی بویت، داوای لێبوردن بکە و قەرەبوی بکەرەوە و بە مێشکت بڵێ ئەو ڕێگایانەی کە تاوەکو ئێستە ڕۆیشتوم، کاریان بۆ کردوم، بەڵام ئێستە ئیتر ڕێگەگەلێکی باش نین و چاوەڕێم کە ڕێگەچارەیەکی ئاقلانەترم پێبدەیت. ئەوکاتەیە کە مێشکت دەچێت بەناو بیرو خەیاڵدا. کاتێك مێشکی خۆتان فێری دۆزینەوەی ڕێگە نوێیەکە کرد، ئەوا مێشکتان هەر لەبەیانیەوە ئەوکارە ئەنجامدەدات و بەلای ئەوەوە جیاوازی ناکات، چونکە ئەیەوێت ڕێگە نوێکە فێری ئێوە بکات و ئێوە بەهاوسەنگی بهێڵێتەوە. بەواتایەکیتر ئیرەیی، شەڕەنگێزی، خەجاڵەتی و تەریقبونەوە، غەیبەت و هەموو ئەم سیفەتانەی کە ئێمە بۆ مرۆڤەکان باوەڕمان پێیان هەیە، هەر هەمویان فێر بوین. خۆ هیچ کەسێك بەم سیفەتانەوە لەدایك نابێت. بەڵکو فێریان بوین. مێشکمان بۆ ئەوەی بە هاوسەنگی بمانهێڵێتەوە، بەم ڕێگایانەدا دەڕوات. غەیبەت دەکات و پاشملە باسی خەڵکی دەکات بۆ ئەوەی توڕەییە پەنگخواردوەکەی خاڵی ببێتەوە و پەستانی بێتە خوارەوە. باشە هەوڵبدەن کە فشار و پەستانی خۆتان بە ڕێگەیەکیتر بێهننە خوارەوە، چونکە غەیبەت

دەبێتە هۆی بێ ڕێزی و پچڕانی پەیوەندییەکان، ئەوەش بزانە کە مێشکت تەنها بەهۆی ئەوەی کە پرسیاری لێبکەیت پێشنیارگەلێکی نوێت پێدەدات.

***

تکایە ئەو مۆرکانەی کە بەخۆتانەوە لکاندوە، لێیان بکەنەوە و سەر لەنوێ خۆتان دروستبکەنەوە و لەبری (هەستکردن بە کەمتەرخەمی) (هەست بە لێپرسراویەتی) بکەن، لەبری (ترس) هەست بە (عەشق) بکەن و فێری ببن، هەر لەم ساتەیەوە لەبری ئەوەی کە بیر بکەنەوە ئەگەر من ئەمکارە ئەنجامبدەم خراپە و ئەگەر ئەوکارە بکەم فلانەکەس پێیناخۆشە، بەخۆتان بڵێن من کەسێکی باڵغم و پێموایە ئەم ڕێگەیە ڕاست و دروستە و ئەنجامیدەدەم. ئەمکارەم کرد، هەڵەم کرد، لێپرسراویەتیەکەی دەگرمە ئەستۆ و داوای لێبوردن دەکەم، بە هەستکردن بە لێپرسراویەتیەوە لەگەڵ خۆتان و خەڵکیدا هەڵسوکەوت بکەن و پەنجەی تۆمەت بەرەو هیچکەسێك ڕامەکێشن. بەشێوەیەکی ئەرێنی بیر بکەرەوە و (عەشق) بخەرە جێگەی ترس و (هەستکردن بە لێپرسراویەتی) بخەرە جێگەی (هەستکردن بەتاوان)ەوە، بۆ ئەوەی ژیانت ١٨٠ پلە بەشێوەیەکی ئەرێنی بگۆڕدرێت.

## بەڕاستی چ کاتێک بابەتێک دەزانین؟

ئەوانەی کە لە سیمینارەکانی مندا بەشدارییان کردوە، دەزانن کە لەپاش پێشەکیەك، زۆربەی کات یاداوەریی دەکەم، ئەو یاداوەریەش بریتیە لە سێ ووشەی مەترسیدار، سێ ووشە کە ئێمە بە زۆری بەکاریان دەهێنین. سێ ووشە کە ئێمە لە فێربون دور دەخاتەوە و دەبێتە ڕێگر لەبەرەوپێشچونماندا و ناهێڵێت بە دیدێکی نوێوە سەیری دونیا بکەین. سێ ووشە کە پەیوەندییەکانی ئێمە لاواز دەکەن. ئەم سێ ووشە زۆر سادە و زۆریش مەترسیدارن کە بریتین لە: (من ئەمە دەزانم).

***

هەرکاتێك بەخۆتان گوت: (من ئەمە دەزانم) یەکسەر بوەستن. لە خۆتان بپرسن (چۆن ئەوەندە دڵنیام؟)، باشە نیشانەی زانینی بابەت و مەسەلەیەك چیە؟ چۆن دەتوانم لەوە دڵنیاببمەوە کە هەر بەڕاستی ئەم بابەتە دەزانم؟ باسکردن و زانینی زۆر سادەیە. مرۆڤ کاتێك بەڕاستی بابەتێك دەزانێت کە خەریکە (ئەنجامی دەدات). بۆ نمونە وایدابنێن کە سەبارەت بە ڕاستی، دروست هەڵسوکەوت کردن، ڕاستگۆیی و ئەدەب، ڕێزگرتن لە مافی خەڵکی. من کاتێك دەزانم

ڕێزگرتن لە مافەکانی خەڵکی چیە، کە جێبەجێی بکەم. من کاتێك دەزانم عەشق چییە، کە بەڕاستی عاشق بم. عەشق لە هەموو بوارەکانی ژیانمدا جێبەجێ بکەم. کاتێك من دەزانم چۆن دەکرێت قورمە سەوزی لێبنرێت، کە لێی دەنێم. وەگەرنا یان بیستومە یاخود وادەزانم کە لێنانی ئەو چێشتە دەزانم.

***

لەو حیوار و گفتوگۆیانەی کە هەمبوە، بینیومە بۆ نمونە کاتێك ویستومە دەرگای قسەوباس لەبارەی مەسەلەیەکەوە بکەمەوە، لایەنی بەرامبەرم هەڵیداوەتی و گوتویەتی( بەڵێ، بەڵێ من ئەو مەسەلەیە دەزانم. زۆر سوپاست دەکەم مەنونم..) و ئیتر تەواو. یاخود لەوانەیە خۆم ئەم هەڵەیە بکەم(کە هیوادارم نەیکەم). کەسێك ئەیەوێت شتێك فێری من بکات، بەڵام من دەڵێم بەڵێ خۆم دەیزانم. ئەمە لەکاتێکدایە کە نایزانم. بەڵکو بیستومە یان لە جێگەیەکدا خوێندومەتەوە. خۆ بیستن و خوێندنەوە نابێتە زانین. با هەمیشە قسەی ئەو پیاوە گەورەیە (کۆنفۆشیۆس)مان لەبیر بێت کە دەڵێت (کاتێك ئێوە شتێك دەخوێننەوە، دەچن بەناو بیرو خەیاڵدا. بەڵام هێشتا ئەو شتە نازانن). هەروەها دەڵێت (بیستم و لەبەرم کرد. ئەنجاممدا و زانیم).

***

ئێوە کاتێك کارێك ئەنجامدەدەن، ئەوکات دەزانن ئەوکارە چییە. نمونەیەك  کە بۆ من بەرکارە، ئەمەیە کە ماستەرەکەی من

بیوفیزیکە، داویان لێکردم کە فیزیا بڵێمەوە. من وامدەزانی ئەمە دەزانم، بەڵام کاتێك چومە ناو پۆلەوە تازە زانیم کە فیزیا چیە. پێشتر خوێندبومەوە، لەبەرم کردبوو، لە مامۆستاکەمەوە بیستبوم و تاقریکردنەوەیشم تێدا کردبوو، بەڵام نەمدەزانی چیە هەتاوەکو ئەوکاتەی کە ویستم وانەکەی بڵێمەوە. هەربۆیە من هەمیشە ئامۆژگاری ئازیزان و خۆشەویستانمان دەکەم کە ئەو بابەتانەی دەیانخوێنن، ئەو فێرکارییانەی کە دەیانکڕن و لەماڵەوە سەیرییانە دەکەن یاخود دەیانخوێننەوە و دەیانبیستن، بۆ خەڵکیان بگێڕنەوە. ئەمکارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشگەلێکی زیاتر لە بیرو زەینی ئێوە گیرۆدەی بابەتەکە ببێت، ئێستە کە دەتانەوێت بیگوازنەوە بۆ خەڵکی، ئەوکات زۆر جوان لە بیرو مێشکی خۆتاندا جێگیر دەبێت. بەمشێوەیە و بەمکارە پێش ئەوەی خزمەتتان بە خەڵکی کردبێت، خزمەتی خۆتان کردوە. لەمەش گرنگتر، ئێستە کە زانیوتانە و شارەزای بون، بەخێرایی جێبەجێی بکەن. بۆ نمونە سەبارەت بە ڕێزگرتنی هاوسەر، یان سەرکەوتن، یاخود ئامانج و پەیوەندی دۆستانە، لەم شوێنەدا کۆمەڵێك قسەوباس دەکرێت. یەکسەر ئەمە جێبەجێ بکەن، کاتێك جێبەجێتان کرد، یەکسەر لەدڵ و دەرونتاندا شوێنی خۆی دەگرێت.

نمونەیەك هەیە کە چەندین ساڵ لەمەوبەر لە زاری هاوڕێیانمەوە بیستومە. دەیانگوت فلانەکەس لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا کۆچی دوایی

کرد و لە ٨٥ ساڵیدا دفنیان کرد. ئەوکات لە مەبەستەکەیان تێنەدەگەیشتم. دواتر ئەو هاوڕێ ئازیز و قسەخۆشەویستەمان گوتی: ئەم کەسە لە ٢٠ساڵییەوە تاوەکو تەمەنی ٨٥ ساڵی هیچ شتێکی نوێ فێر نەبوو، کەوابوو لە٢٠ ساڵیدا مرد و لە تەمەنی ٨٥ ساڵیدا تەرمەکەیان خستە ژێر گڵەوە. با پرسیار لە خۆمان بکەین کە ئایا فێربون تەنها لە قوتابخانە و زانکۆو پەیمانگاکاندایە، یاخود لە ژیانیشدا دەتوانین فێر ببین؟

***

کاتێك دەچنە ناو فەرمانگە یاخود ڕێکخراوێکەوە، یاخود ناسراوی لەگەڵ کەسێکدا پەیدا دەکەن، هیچکات ئەم کاتەتان بە خۆتان داوە کە (من ئەمە بناسم، ئەگەر بیناسم، ئەوا باشتر دەجوڵیمەوە). من لەم داستان و بەسەرهاتانەم زۆر لەلایە. جارێکیان چوم بۆ فەرمانگەیەك و ئیشێکم هەبوو. کاتێك چومە ناو فەرمانگەکەوە، دەبینم مێزێك دانراوە و نزیکەی ٢٠ بۆ ٣٠ کەسیش کاغەزەکانی خۆیان خستبویە سەر مێزەکە و چاوەڕوانی واژو بون. ئەو کەسەیش لەناو کاغەزەکاندا خولەی دەهات. منیش لەوێدا بێدەنگ دانیشتم، بیرم کردەوە بۆ ئەوەی بزانم چ قسەو باس و گفتوگۆیەك لەنێوان ئەم کەسانەدا دەکرێت، وەڵامی چ کەسێك بەباشی دەداتەوە. دژایەتی چ کەسێك دەکات. من دەمتوانی لەو ووشانەی کە لەوێدا دەگوترێن شت فێر ببم. چوم و لە سوچێکدا دانیشتم. زۆر خێرا زانیم کە ئەم

کارمەندە پێویستی بە سەرنج و گرنگیپێدانی زیاتر هەیە. چونکە وەك لێپرسراوێك دەتوانێت بە موراجیعەکان بڵێت فەرمون دابنیشن، بۆ ئەوەی یەك لەدوای یەك کارەکانتان ڕایی بکەم. بەڵام زۆری پێخۆش بوو کە هەمووان بڕژێن بەسەر مێزەکەیدا و بڵێن جەنابی بەڕێوەبەر ئەم واژوەم بۆ بکە، زۆر سەیر بوو کە لەناو جەرگەی خەڵکەکەوە ڕێگەیەکی بۆ خۆی کردەوە و بە منی گوت (کاکە تۆ ئیشت چیە؟) سەرم سوڕما کە لەناو ئەو کۆمەڵە خەڵکە زۆرەدا، منی بینی. دیاربوو کە ئاگای لە هەمویەتی و دەزانێت چ کەسێك سەرنج و گرنگی پێدەدات و چ کەسێك سەرنجی نادات. منیش گوتم: تۆ سەرت قاڵە و ئەمەش ویژدان نییە کە منیش هێندەیتر باری سەرشانتان قورس بکەم. هەرکاتێك سەرتان سوك بوو منیش دێمە پێشەوە. دوبارە ڕێگەکە داخرایەوە و هات و هاواری خەڵکەیش بەرز بویەوە...کاکە واژوم بۆ بکە...! کاکە واژوم بۆ بکە...! چەند خولەکێك دواتر دیسانەوە خەڵکەکەی خستەلاوە و بە منی گوت کاکە ئێوە بێنە پێشەوە، منیش گوتم: باشە ئێستە کاتێکی گونجاوە کە بێمە پێشەوە؟ گوتی: بەڵێ وەرنە پێشەوە. ڕویکردە خەڵکەکە و گوتی: هەموتان بڕۆن دابنیشن، دواتر لوتفیان نواند و کارەکەی منیان بەڕێخست و تەنانەت تەلەفۆنی بۆ کارمەندەکەیتریش کرد کە بەخێرایی ئیشەکەم ڕایی بکات. ئەمە بۆچی؟ چونکە کاتێك من چومە ناو ژورەکەوە، بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئاخ دیسانەوە توشمان بویەوە بە توشی ئەم کەسانەوە. کاتم بە خۆمدا کە بەباشی

بیناسم. کاتێك ناسیم و شارەزای تایبەتمەندی و تەبیعەتەکانی بوم، ئەوکات پەیوەندییەکی باشتر لەنێوانماندا دروستبوو. من دڵنیام کە ئەگەر هەر ئێستەیش بچم بۆلای ئەو بەڕێزە و ئیشم هەبێت، یەکسەر بۆمی ئەنجام دەدات. بەڵام ئێمە دەڵێین (دەزانین)، گریمانی ئەوە دەکەین کە دەیزانین، (من دەزانم ئەم کەسە هیچ ئیشێك ڕاناپەڕێنێت). ئەمە وانییە و نابێت لەدورەوە حوکم بەسەر کەسدا بدەین.

تکاتان لێدەکەم لەمە بەدواوە تاوەکو بۆتان دەکرێت ئەم سێ ووشە مەترسیدارە کەمتر بەکار بهێنن و مەرجی (زانین) کاتێك دابنێین کە ئەوکارە خەریکە (ئەنجام) دەدرێت. تاوەکو ئێستە نەبوە کە بۆ یەکجاریش ئەم هەلە بە بەرامبەرەکانم بدەم و شتێکی نوێ فێر نەبم. لانی کەم ئەو شتەی کە فێری بوم ئەوە بووە کە ئەم کەسە ئەیەوێت خۆی دەربخات. ئێمە نازانین، بەڵام پێمانوایە کە دەزانین، بیستومانە یان خوێندومانەتەوە. باشە ئێوە دەزانن چی لە بیرو مێشکی هاوسەرەکەتاندایە؟ یان چی لە مێشکی منداڵەکەتاندایە؟ کوڕی خۆم کچی خۆم! ئایا ئێوەش دەزانن کە چی لە بیرو خەیاڵی دایکوباوکتاندایە، باشە ئێمە دەزانین خەڵکی چۆن بیر لە ئێمە دەکەنەوە؟ دەزانین کە چیمان دەوێت؟ دەزانین کە چی بکەین بۆ ئەوەی ئاسانتر و خێراتر بە خواست و ئارەزوەکانمان بگەین؟ دەزانین چۆن چاودێری لە جەستەی خۆمان بکەین؟ نەخێر، ئێمە تەنها بیستومانە.

***

ئێمە شتانێکی زۆرمان بیستوە. لە ڕادیۆ، تەلەفیزیۆن و لە ئینتەرنێت و....هتد و وادەزانین هەموو ئەو شتانەی کە بیستومان حەقیقەت و ڕاستین، هەربۆیە وەك عەقیدە و بیروباوەڕی خۆمان وەریان دەگرین و لەسەر بنەمای ئەو شتانە دەژین. ئێمە بیستومانە یان خوێندومانەتەوە، بەلاّم (نازانین). هەر لەبەر ئەمەیە کاتێك کەسێك سەری یان پشتی ئێش دەکات، پێشنیاری خواردنی حەبێکی بۆ دەکەین، ئەمە لەکاتێکدایە ئەمە ئیشی ئێمە نییە (من جارێکیان پشتم دایە ئێش. دکتۆر ئەم حەبەی پێدام و چاکبومەوە، بەلاّم نازانم بۆ ئازارەکەی ئێوە بەسودە یان نا) دەتوانین ئەمە بڵێین. بەلاّم ئەوەی کە هەرکەسێك پشتی یان سەری ئێشی کرد، ناتوانین پێی بڵێین ئەم حەبە بخۆ. چونکە ئێمە بیستومانە و خوێندومانەتەوە.

***

تکاتان لێدەکەم ورد ببنەوە و سەرنج بدەنە سەر چەند لایەنێك: یەکەمیان ئەوەی کە مرۆڤ دیلی ئەو باوەڕ و فیکرانەیە کە هەیەتی. لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانەی کە وەریاندەگرێت، دەستدەکات بەداوەری کردن. با کەمێك قوڵتر بین، کەمێك پاکوپێکەیشتوتر بژین و بە سادەییەوە نەبینە یاریچەی دەستی هیچ کەسێك. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێنمایی هەڵە نەکەین، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر، باشتر وایە سەرقاڵی شتانێك بین کە زیاتر پەیوەندیان بە ئێمەوە هەیە.

وەك هاوسەرەکەمان، ئیش و کارەکەمان، منداڵەکانمان و شارەکەمان. سەرەتا دەبێت لەمانەدا ببمە مامۆستا و دواتر بچم بۆ قۆناغە پێشکەوتوەکان. لە سیاسەت، لە پزیشکی، لە کارەباو ئەلەکترۆنیات و....هتد زۆر بەکەمی هاوڵاتیانی ئێمە هەن کە تێڕوانینیان نەبێت. بەڵام ئەوەی کە بەڕاستی ئەمە ڕاستە یان هەڵەیە، ئەوە دەبێت لە خاوەن تێڕانین و بیرو بۆچونەکان بپرسین. خاوەن بیروبۆچونەکانیش هەمیشە ئەو کەسانە نین کە چوبنە زانکۆ. بەڵکو کەسانێکن کە کاتی خۆیان لە بابەتێکدا سەرف کردووە و تێیدا قوڵ بونەتەوە.

***

هەروەها پێویستە ئەوەمان لەبیر بێت کاتێك بەشای شتەکان فێر دەبین، کە خەت و هێڵ بەسەر ئەم سێ ووشە ترسناکەدا بهێنین و لە بیرو زەینماندا بیانسڕینەوە کە بریتین لە (من ئەمە دەزانم!).

## لوتفی دووباره و چاوەڕوانی مسەوگەر

کاتێك لەزانکۆ بوین، یەکێك لە هاوڕێکانم بەناوی (عەلی) کوڕێکی زۆر بە بەزەیی و ڕێکوپێك بوو، کاتێك دەچوو بۆ ئەوەی ژەمی خواردن بۆ خۆی وەربگرێت، لە من و هاوڕێیانیتری دەپرسی کە ئایا ئێمەش دەمانەوێت یان نا. هەربۆیە بۆ هەمومان ژەمە خواردنەکەی وەردەگرت و هەرخۆی پارەکەی دەدا و دواتر پارەکەی لێوەردەگرتینەوە. کارگەیشتبویە ئەوەی عەلی –کە زۆر حەزی لەمکارە بوو حەزی دەکرد ئەو چاکەیەمان لەگەڵدا بکات و لەنێوان هاوڕێکانیدا کاریگەر بێت– دەچو بۆنمونە ٢٠ ژەمە خۆراکی دەکڕی. بەڵام هەندێکات هاوڕێیان لەبری ئەوەی کە سوپاسی بکەن کە لەبری ئەوان دەڕوات و ئەو کارە ئەنجام دەدات، نەك تەنها سوپاسیان نەدەکرد، بەڵکو بۆ نمونە دەیانگوت: (عەلی ئەمە کەی خواردن بوو؟) منیش بەسەرسوڕمانەوە دەمگوت: (مەگەر عەلی چێشتەکەی لێناوە بۆتان کە ئاوا ڕەخنەی لێدەگرن؟ حەزی کردووە خزمەتێکتان پێشکەش بکات، خۆ ئەوە ئەرکی ئەو نییە). هەروەك بڵێی لەبەر ئەوەی کە خواردنەکەی ناخۆش بووە ئیتر نابێت پارەکەی بدەنەوە.

ئەمە لەبیرو زەینی مندا مایەوە و دواتر و چەندینجار ئەم ڕووداوانەم لە شوێنانێکیتردا دەبینی کە دووبارە دەبونەوە.

***

ئازیزانی من! مرۆڤ لە بیرو زەنینیدا خاوەنی تایبەتمەندیەکی خۆیەتی، ئەویش ئەوەیە کاتێك شتێك دوبارە دەبێتەوە، چاوەڕوانی و تەوەقوعی بۆ دروستدەکات. بۆ نمونە ئەگەر کەسێك هەموو ڕۆژێك سڵاومان لێبکات و هیچ خزمایەتیەکیشی لەگەڵماندا نەبێت، ئەگەر بێت و ڕۆژێك سڵاومان لێنەکان، یەکسەر لێی دەڕەنجێین کە بۆچی سڵاوی لێ نەکردوین. مرۆڤێك نەریتی وایە کاتێك میوانداری دەکات، من و ئێوە بانگهێشت دەکات. تاوەکو ڕۆژێك گوێمان لێ دەبێت کە دەعوەتی و میوانیەکی ڕێکخستوە و من و ئێوەی داوەت و بانگهێشت نەکردووە. بە گریمانی زۆر یەکەمین کاردانەوەیەك کە لە ئێمەدا ڕودەدات، ئەمەیە کە تەلەفۆنی بۆ بکەین و پێی بڵێین: (ئەی بێ وەفا باشە بۆچی ئێمەیشت بانگهێشت نەکرد؟ باشە با ئێمە ئێستە ئاوا کەسێکی خراپ بین؟) و ئەمجۆرە قسانە. لەکاتێکدا ئەگەر لۆژیکە سادە بیرکارییەکەی لەبەرچاو بگرین، بۆ نمونە ئەم کەسە ٥ جار ئێمەی دەعوەت کردووە و بۆ جاری ٦ داوەتی نەکردوین. ئیتر بە هەر هۆیەکەوە بووە. دەبێت بزانین هێشتا ٥ داوەتی ئەو کەسە قەرزدارین. بەڵام دەبینین ٥ دانە داوەتی قەرز گۆڕدراوە بە داواکاری شەشەم!!

لە ئاستەکانی تریشدا هەر وایە. بۆ نمونە ووزەی کارەبا کە ئێمە زۆرێك لە کاروبارەکانمانی پێ بەڕێدەکەین. ژمارەیەکی زۆر لەوپێناوەدا کار دەکەن و چاودێرن و سوتەمەنی دەگەیەنن. ملیۆنان کەس خەریکن ئیش دەکەن بۆ ئەوەی من و ئێوە ئیسراحەت بین. کاتێك کارەبا دەکوژێتەوە، کۆمەڵێك لە خەڵکی هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە کە بۆچی کارەبا کوژایەوە.

-کاکە بەکارهێنانی کارەبا لە ئاستێکی بەرزدایە، کەمێك بەکارهێنانی کارەبا کەم بکەرەوە.

-باشە بۆچی دەبێت کارەبای کەم بەکار بهێنم؟

-دەی باشە، کەمی مەکەرەوە، کارەباکەت دەکوژێتەوە.

لە هەموو شتێکدا خۆمان بە خاوەن قەرز دەزانین، لەبیرمان بێت و بزانین کە مرۆڤە خۆشبەخت و بەختەوەرەکان، ئەو مرۆڤانەن کە لەناخ و دەرونی خۆیاندا گەیشتون بەم دەرئەنجامەی کە (من هیچم لەلای کەس نییە. زۆریش قەرزدارم، خۆزگایە بمتوانیایە قەرزەکانم بدەمەوە) ئێمە تاوەکو تەوقەسەرمان لە هەموو بوارەکاندا قەرزداری هەموو مرۆڤەکانی دەوروبەری خۆمانین.

***

باش لەبیرمەکە ڕۆژێکیان لە خزمەتی پیاوێکی گەورە و مەزندا بوم و شانازی قوتابیەتیم پێبڕا و بەیەکەوە قسەو باسمان دەکرد. بەڕێزیان گوتی کە ئێمە قەرزداری مرۆڤەکانین. دەبێت خۆشحاڵ بین کە خزمەتمان دەکەن و دەبێت ئەوەش بزانین کە بەبێ ئەو

خزمەتەی ئەوان ژیان بۆ ئێمە سەخت دەبێت. ئەو بەڕێزەی کە لەوێدا ئامادەبون گوتی: (ئەو نمونانەی کە جەنابتان ئاماژەتان پێکردن، بۆ سود و بەرژەوەندی خۆیان ئەو ئیش و کارانە دەکەن. خۆ ئەگەر سود و قازانجی بۆ ئەوان تێدا نەبێت، بەدڵنیاییەوە ئەوکارانە ناکەن) منیش زۆرم حەزدەکرد کە بزانم ئاخۆ دەبێت وەڵامی ئەو مامۆستا بەڕێزە چی بێت. مامۆستا گوتی: (بەڵێ، ئەو کەسەیش کە لە نیوەشەوە تاریکەکاندا بەدیواری ماڵەکەی ئێوەدا دێتە سەرەوە بۆ ناو ماڵەکەتان بۆ ئەوەی دزی بکات، خۆ ئەویش لەبەر بەرژەوەندی خۆی ئەمکارە دەکات. بەڵام دەبێت ئەوەمان بەباشی لەبیر بێت کە سود و بەرژەوەندی کەسێکی کاسب، بەرژەوەندی ئێمەیە، بەڵام بەرژەوەندی دزێك بەزیانی ئێمەیە.) کەسێکی ئیشکەر و کاسب بەجۆرێك سود و بەرژەوەندی دەبات کە سود و قازانجەکەی سودێکی تێدایە بۆ ئێمەش. هەربۆیە دەبێت ئێمەش بەجۆرێك بژین کە سود و بەرژەوەندییەکانمان لە سود و قازانجی خەڵکانیتردا بێت، نەوەك کێشەیان بۆ دروستبکەین و گرفتیان بۆ بتاشین. من ئەگەر لە فەرمانگەیەکدا دانیشتوم، دەبێت ئەوە بزانم کە بەڕێکردن و ڕاییکردنی ئیشی خەڵکی، ئەرك و کاری منە. ئەگەر کەسێك هاتە ناو ژورەکەمەوە، دەبێت بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئیشەکەی بۆ بکەم و کارەکەی ڕایی بکەم. ئەگەر من باوك و گەورەی خێزانم و داوا و تکایەکم لێدەکرێت و منیش دەتوانم

لەماوەی ٥ خولەکدا ئەنجامیبدەم، باشە بۆچی دەبێت بیخەمە کاتێکیتر یاخود بەیانی؟!

***

بەڵام دەبێت ئەوەم لەبیر بێت کە لوتفی بەردەوام و دووبارە، دەبێتە تەوەقوع و چاوەڕوانیەکی مسۆگەر. هەربۆیە فۆڕمێکی سادە هەیە کە پێشنیاری دەکەم بۆتان. ئەم فۆڕمە سادەیەش، بریتیە لە (ناوبڕ). بۆ نمونە ئەگەر ٣ یان٤ جار کارێك بۆ کەسێك ئەنجامدەدەن، مەودایەکی بخەنە نێوانەوە و دواتر دیسان کارەکەی بۆ ئەنجامبدەنەوە. بۆ ئەوەی لایەنی بەرامبەر بزانێت کە (نەبونی)ەکیش هەیە و لە دووبارە ئەنجامدانەوەی خۆشحاڵ ببێت. مەودا بخەرە نێوان خزمەتگوزاریەکانتەوە بۆ ئەوەی لەبەرچاوی بەرامبەرەکانت، نەبێتە ئەرك و مافێکی حەق و واجیب لەسەرشانت، چونکە ئەگەر بەردەوام لوتف بکەن و خزمەت بکەن، بەڵام یەك ڕۆژ نەیکەن، لێتان دەڕەنجێن. بەڵام ئەگەر مەودا و ناوبڕ و پچڕانێك لەنێوانیاندا هەبێت، لەسەر ئەو حاڵەتە ڕادێت و ئەگەر ڕۆژێك نەچیت لەبەر خۆیەوە دەڵێت کێشە نییە، بۆ بەیانی هەر دێت، بەمشێوەیە لێتان زویر نابێت.

***

دەبێت خۆیشمان ئەوەمان بەباشی لەبیر بێت کە نەبینە کەسێکی چاوەڕوانکار. بەیانی تاوەکو ئێوارە ئەوە بەبیری خۆمان بهێنینەوە کە ئێمە قەرزدارین، نەوەك خاوەن قەرز. دەرزی، دەرمان، پزیشکی،

ڕێگا، ئاو، کارەبا، خواردن، سەلاجە و بەفرگر، موجەمیدە، کەرەستەکانی سەرگەرمی، تەلەفیزیۆن، بابەتە فێرکارییەکان و ئینتەرنێت، هەموو ئەمانە دەرئەنجامی خزمەتگوزاریگەلێکن کە خەڵکانیتر خەریکن ئەنجامیان دەدەن و ئێمەش بەهرە و سودیان لێوەردەگرین. با لەخۆمان بپرسین من لەم گۆی زەوییە گەورەیەدا چ خزمەت و بەهایەکی زیادەم بۆ خەڵکی هەیە؟ ئەگەر نیوەی کاتیشم لە خزمەتکردنی خەڵکیدا خەرج بکەم، ئەوا ئەرکی خۆم ئەنجامداوە و خەریکم قەرزەکەی سەرشانم کەم دەکەمەوە. هیچ قەرزێکم لەلای خەڵکی نییە.

***

بەڵام خاڵی دواتر، ئەم بابەتەی کە ئێوەی هاوڕێی خۆشەویست خەریکن دەیخوێننەوە، تاوەکو ئاستێکی باش بۆ ئێوە هەرزانە و ئێستە کە کتێبێك لەم کۆمەڵە بابەتانە چاپکراوە و هەستتان بە کڕینی کرد–شتێك کە یارمەتی ئێوە دەدات بۆ ئەوەی ژیانێکی باشترتان هەبێت– بەوپەڕی حەزوئارەزووەوە بیکڕن و پارەکەی بدەن. ئەو کەسانەی کە سەرقاڵی کارکردنن، دەبێت ژیانیان بسوڕێت. ئەگەر من و ئێوە ئاوا بیر بکەینەوە و لەبری (وەرگرتنی) بەردەوام بڵێین باشە من لەبەرامبەردا دەتوانم چ (خزمەت)ێك ئەنجام بدەم، ئەوکات ژیانی هەموان ئاسان دەبێت و هەموو خەڵکی خۆشحاڵ و شادومان دەبن.

***

هونەرمەنێد ٦٠ خولەك مۆسیقا لەناو ئەلبومێکدا تۆمار دەکات، ٦٠ خولەك مۆسیقا کارێکی زۆرە. بۆ ئەوەی بزانن کە چەندە ئەزیەت و ناڕەحەتی هەیە، هەر ئەمەتان عەرز دەکەم کە بتهۆفن، تەنها بە ٤ بۆ ٥ سەمفۆنیان لە دوونیادا ئەو ناوو ناوبانگەی پەیدا کرد. تەمەنێك کاری کردوە و ئەم چەند سەمفۆنیایەی بەدیهێناوە. تەمەنێك.... با کارێك بکەین کە هونەرمەندان، بتوانن داهاتیان هەبێت. با کارێك بکەین کە بیرمەندەکان داهاتیان هەبێت. با کارێك بکەین ئەو کەسانەی کە بونیان بەسودە بۆ کۆمەڵگە، داهاتی خۆیان هەبێت. بەوپەڕی ئارەزوو حەزەوە پارەیان پێبدەین و کارێك بکەین کە هەمویان شەوق و زەوقیان هەبێت کە دەگەن بە وەها پلەو پایەیەك. بەمشێوەیە دەبینین، کۆمەڵگە پڕ دەبێت لە ئەدیب و ووتاربێژ و هونەرمەند و ژیان جوانتر دەبێت. نەوەك مۆڵەت بدەین و بهێڵین خودای نەکردە مامۆستایەکی زانکۆ یان هونەرمەندێك وەیاخود مامۆستایەکی قوتابخانە لە هەژاریدا دەست لە خەڵکی پانبکاتەوە و بمرێت و ئێمەش قەدری نەزانین. کۆپی کردن و نەکڕینی نوسخەی ئەسڵی ئیش و کارەکانی ئەو بەڕێزانە نەك تەنها دەستپێوەگرتن و سکهەڵگوشین نییە، بەڵکو بەمکارە، بەئاراستەی دژە باشبونی ژیانی خۆمان جوڵاوینەتەوە. وەرن با ڕاهێنان بکەین و بەیانی تاوەکو ئێوارە بە خۆمان بڵێین: (من قەرزدارم نەك قەرزم لەلای خەڵکی بێت) هەربەڕاستیش قەرزدارین. ئەگەر مامەڵەمان لەگەڵ موراجیع و کارمەندان و هاووڵاتیان و هاوسەر و منداڵەکانماندا بە جۆرێك بێت کە

بزانین چۆن دەتوانین قەرزەکانمان بەرامبەر بەوان بدەینەوە، ئەوکات دەبینن کە دونیا چەندە جوان دەبێت. بەڵام لەم قۆناغەدا دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت کە:

١ – لوتفی بەردەوام دەبێتە تەوەقوع و چاوەڕانی سەلمێنراوو مسۆگەر. کەواتە دەبێت لەم شێوازانەی کە بەکاریان دەهێنین، ئەوەمان لەبیر بێت کە لەناوەڕاستی ئەم لوتف و میهرەبانیانەدا دابڕان و ناوبڕێك دابنێین، کە لایەنی بەرامبەر مەسەلەکان بە ئەرکی سەرشانی ئێمە نەزانێت و هەمیشە چاوەڕوان نەبێت کە ئەوکارانە ئەنجام دەدەین و هەمیشە خۆشحاڵ و بێخەم نەبێت بەوەی کە ئەو ئەرك و کارانە ئەنجام دەدەین.

٢ – با بەبیری خۆمانی بهێنینەوە کە خەڵکی ئەرکیان نیە خزمەتی خۆڕایی پێشکەش بە ئێمە بکەن. نە من منداڵم و نە ئەوانیش دایکوباوکی منن، با بەبیری خۆمانی بهێنینەوە و لە خۆمان بپرسین کە چۆن دەتوانین قەرەبوی ئەو خزمەتانەی ئەوان بکەینەوە. کاتێك ئاستی چاوەڕوانیەکانت هاتە خوارەوە، ئەوکات ئاستی هێزی خۆشیت بەرز دەبێتەوە و یەکسەر شادومان دەبیت و چێژ لە ئەنجامدانی هەرکارێك وەردەگریت.

***

خانمان و پیاوان. من بە ملیارەها قەرزداری ئەو کەسانەم کە بە هەر ڕێگەیەك یارمەتی منیانداوە. من یەکەمین بەرنامەی فێرکاریم لەساڵی ١٩٩٢ لە ئەمریکای باکوردا بە بەهای ١٥٠ دۆلار کڕی.

کەسێك بە سەرسوڕمانەوە پرسی باشە بۆچی ئەوەندە گران؟ منیش گوتم ئەگەر تەنها یەك بابەت لەم بەرنامەیەدا هەبێت کە یارمەتی من بدات لە ژیانمدا گۆڕانکارییەکی بچوك بەدی بهێنم، ئەوە من حەقدەستی خۆمم وەرگرتوە). هەروەها عەرزی ئێوەی بکەم لەو بڕیارەی کە ئەو ڕۆژە دام و ئەو بەرنامەیەم کڕی، نزیکەی ١٥ ملیۆن دۆلار لە ژیاندا پێشکەوتم. خۆ ئەگەر ئەو بەرنامەیەم بە خۆڕایی دەستبکەوتایە، یاخود کۆپیم بکردایە، بەگریمانی زۆر دەچویە ڕیزی ئەو بەرنامە و پڕۆگرامانەوە کە پشتگوێم خستون و هەرگیز سەیریان ناکەم. با نرخ و بەهای ژیان بدەین و بە ڕەشیدی و پێگەیشتنەوە بژین و یارمەتیدەر بین بۆ ئەوەی مرۆڤ بەنرخەکان لەناو کۆمەڵگەماندا گەشە بکەن. لە هەر شوێنێك و بەهەر شێوەیەك کە دەتوانین با هاوکار و یارمەتیدەری خەڵکانی باش و چاك و بەسود بین. پێیان ڕابگەیەنین. من خۆم سیدی و کتێبانێکی زۆرباشم لەلایەو و بە دیاری دەیانبەخشم. یەکەم لەبەر ئەوەی کە دیارییەکی نەوعیە و دوەمیش لەبەر ئەوەی کە ئەگەر بێت و ئەم دیارییەی من گۆڕانکارییەك لە ژیانی ئەو کەسەدا دروستبکات، ئەوا هەمیشە لەبیر و یادی مندا دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا من خزمەتێکی گەورەم بە خاوەن و بەدیهێنەری ئەو بەرهەمە کردوە. سەرەڕای ئەمەش بەوپەڕی بڕوای خۆمەوە، پێموایە کە پڕوپاگەندە و ڕیکلامێکی باشم بۆ کاری ئەو نوسەرە یاخود هونەری ئەو هونەرمەندە کردوە.

***

بابەیەکەوە بڕیار بدەین کە ژیان لە سێبەری ژیری و زانستدا، بکەینە ژیانێکی چێژبەخش. فێری ئەوە ببین کە لوتفی خەڵکانیتر لەناخی ئێمەدا ئەوە بەدی نەهێنێت کە ئەرك و مافە لەسەرشانی خەڵکی کە خزمەتمان بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك لەبەرامبەر کەسێکەوە لوتف دەنوێنین، ئیتر چ منداڵ و چ هاوسەر و چ کارمەند و هاوکارمان بێت، با ناوبڕێك بخەینە ئەو خزمەتانەی کە پێشکەشیان دەکەین، بۆ ئەوەی بە شتێکی ئاسایی و ڕۆتین و ئەرکی ڕۆژانەی سەرشانی ئێمەی نەزانن.

## چۆن لەناو کێشەکاندا چێژ لە ژیان وەربگرین؟

تاوەکو ئێستە پرسیارتان لە خۆتان کردوە کە چەندە لە ئاوخواردنەوە چێژ وەردەگرن: یەك پەرداخ؟ یەك سوراحی ئاو؟ وەڵامەکەی بۆ ئێوە دیاروئاشکرایە. دەڵێن: (پەیوەندی بەوەوە هەیە کە چەندە تینوبم)ئەوە ئەندازە و ڕێژەی ئاوەکە نییە کە چێژ بە ئێوە دەبەخشێت، بەڵکو ئەوە ئەندازە و ڕێژەی تینویەتی ئێوەیە کە ئاوخواردنەوە گرنگ دەکات. لەوانەیە بە دانانی دەستمالێکی تەڕ لەسەر لێوتان، هەستکردن بە ئارامیەکی سەیرتان بۆ دروست ببێت. لەوانەیە ئەگەر خاولیەکی تەڕ بخەنە سەر دەموچاوتان، هەناسەیەك بدەن و زۆر بەقوڵی چێژ وەربگرن. یاخود لەوانەیە یەك پەرداخ ئاو بخۆنەوە و بەهیچ شێوەیەك حەزتان لە پەرداخی دوەم نەبێت. چەندێك خۆشحاڵن؟ یەکسەر دەپرسن مەبەستتان چیە؟ دەڵێین دڵخۆشتری یان دڵخۆشتر نیت؟ ئێوەش دەڵێن سەبارەت بەچی؟

***

ئایا دەکرێت کەسێك بچێتە ناو (سی سی یو) و بڵێت سوپاس بۆ خودا؟ ئەمە پەیوەندی هەیە. هەندێکجار دەبینین کە زۆرێك پێدەکەنن و بێتاقەتن، کاتێك پرسیاریان لێدەکەیت، دەڵێن حاڵی

هاوسەر یان منداڵەکەم یاخود هاوڕێکەم خراپە و لەناو بەشی سی سی یو دایە. یاخود خۆشحاڵ و شادومانە و دەڵێت فلانە خزمم چویە ناو سی سی یوو ئێستە بارودۆخی زۆر باشە و هاتوەتە دەرەوە. مێشکی مرۆڤ بە جۆرێکە کە چێژ لە جیاوازییەکان دەبات. واتە ئەگەر خۆشترین نوکتەکانتان بۆ بگێڕنەوە، پاش ماوەیەك پێناکەنن. دەگاتە جێگەیەك کە مرۆڤ تێر دەبێت و دەبێت شتێکی بەهێزتر یاخود جیاوازتر بێت، تاوەکو مرۆڤ هەست بەم جیاوازییە بکات و چێژ وەربگرێت. من پێموایە کە ئێمە نابێت چاوەڕوان بین، لە هەر حاڵەتێکدا دەتوانین ئەم جیاوازییە بەدی بهێنین و چێژی لێوەربگرین. با خۆشی و ناخۆشیمان بەدەستی خۆمان بێت، هەر لەبەر ئەمەیە کە مرۆڤە شوکرانە بژێرەکان، دڵخۆشترن. چونکە لە خراپترین ساتەکاندا دەتوانن بیانویەك بۆ شوکرانەبژێربون و خۆشحاڵ بون بدۆزنەوە. بۆ نمونە کاتێك پارەکەیان دەسوتێت، دەڵێن سوپاس بۆ خودا کە گیانمان سەلامەت و بێوەیە، دەتوانم سەر لەنوێ پەیدای بکەمەوە. واتە ئەم شێوازە بیرکردنەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ خۆشحاڵ و شادومان بێت.

***

خۆشحاڵبونی خۆمان بەدەستی خۆمانە و ئەندازە و ڕێژەی خۆشحاڵبونیشمان پەیوەستە بە حاڵەتی پێشومانەوە. چەندێك لە خەوتن چێژ وەردەگرن؟ باشە، چەندێك ماندون؟ زۆرێك خەویان لێناکەوێت و کێشەی خەوتنیان هەیە. یان ماندونین و بیروخەیاڵیان

سەرقاڵ و ئاڵۆزە. بیرو فیکرتان بهێننە سەر کاغەز، دەتوانن بخەون. (ئەڵبەتە کۆمەڵێك نەخۆشی هەیە کە مرۆڤ توشی کەمخەوی یاخود بێخەوی دەبێت، دەبێت بچنە لای پزیشکی پسپۆڕ) باشە چەندێك چێژ لە نانخواردن دەبەن؟ بۆ نمونە لەپاش نانخواردن لەگەڵ ئەوەی کە تێر بون بەڵام ماست و میوە دەخۆن، بۆچی؟ چونکە هەستی چەشتنتان خەریکە دەگۆڕدرێت. دەی کەوابو بۆ دڵخۆش بون بۆ چێژوەرگرتن و بۆ شادومانی ژیان سەرنج بدەنە سەر دوو خاڵ:

یەکەمیان ئەوەی کە هەرچەندێك تینوتر، یان برسیتر، وەیاخود ماندوتر بیت، ڕازیکردنی نیازەکەت تۆ خۆشحاڵتر دەکات. کەوابوو با وانەزانین کە ماندویەتی شتێکی خراپە. چێژوەرگرتنی ئێمە لە ئاوی زوڵاڵ یان خواردنی خۆراکێکی ئاسایی یاخود جێگەی خەوتن، پەیوەستە بە ئەندازە و ڕێژەی پێداویستیمانەوە. ئەم هەموو ڕەنجەی ئێوە گەنج و خەزینەی ئێوەیە...! بەڵام بەداخەوە ئەوپەردەیەی کە دراوە بەسەر خەزینەکەی ئێوەدا خودی خۆتانن..!

***

لەبری ئەوەی کە مۆڕ بکەن، هەوڵبدەن سودی لێوەربگرن. باشە جیاوازی مرۆڤی سەرکەوتوو ناسەرکەوتو لە چیدایە؟ سەردەمانێك مەلەوان بوم. ئەو هاوڕێیانەم کە لە جوملاستیکدا بون، حەزیان دەکرد فێری جوملاستیکیش ببم، بەڵام توانا و لێهاتنی من لە جوملاستیکدا خراپ بوو. ڕۆژێکیان داوایان لێکردم کە جوڵەیەك

ئەنجامبدەم، ئەوەبوو من کەوتم و ژمارەیەکیانم بریندار کرد، بەڵام خۆم هیچم لێنەهات. دواتر کاتێك قارەمان و پاڵەوانانی جوملاستیکم دەبینی کە چۆن بەرزو نزم دەکەن، گوتم باشە ئەوانە ماندونابن؟ ئەوکات زانیم کە من لەبەرزبونەوەدا زۆر لە خۆم دەکەم و لە هاتنەخوارەوەشدا خۆم کۆنتڕۆڵ دەکەم بۆ ئەوەی نەکەوم. لە هەردو حاڵەتەکەدا ووزەیەکی زۆر سەرف دەکەم. بەڵام پاڵەوانێکی جوملاستیك، لە هەر کەوتنێکدا، سود و بەهرە لەو کەوتنەی بۆ سەرکەوتن و بەرزبونەوەی دواتر وەردەگرێت. واتە کەوتنەکەی ئەو دەبێتە هۆی بەرزبونەوە، بەومەرجەی کە هونەرەکەیت هەبێت. هەرکاتێك تێکشکایت، لەبیرت بێت کە ئەمە کەوتنێکە بۆ ئەوەی تۆ بگەیەنێتە پلە و قۆناغە باڵاکان. شکست و کەوتن لە تاقیکردنەوەیەکدا دەتوانێت ببێتە پلیکانەیەك بۆ سەرکەوتنی تۆ. ئەوە بەدەستی خۆتە. هەموو مرۆڤە سەرکەوتوەکانی جیهان، کەوتنگەلێکی زۆر خراپ و توندیشیان هەبووە. سروشتی ژیان، ئەمجۆرە کەوتنانەی تێدایە. هەرکاتێك دەگەیت بە نالەبارییەك کە حەزت لێی نیە، هەوڵبدە بۆ سەرکەوتنت سودی لێوەربگریت.

***

کاتێك لە نەوجەوانیدا، پێشنیار یان بیرۆکەیەکم دەخستەڕوو، کە خەڵکانێکی ڕق لەدڵ یان بێمتمانە گاڵتەیان پێدەکردم، سەیری ناوچاویانم دەکرد و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: نیشانت دەدەم کە من کێم! واتە بەهۆی ئەو سوکایەتیەی ئەوانەوە شتێکم بۆ زانست و

زانیارییەکانم زیاد دەکرد. هیچکاتێکیش هەوڵم نەداوە کە شتێك بەهیچ کەسێك بسەلمێنم، هەمیشەیش سوپاسی ئەو کەسانە دەکەم کە گاڵتەیان پێدەکردم. ئەوان دەبونە هۆی سەرکەوتنی من. هەرچەندە ماندان و ئافەرین کردنیش گرنگە. بەڵام دەبێت لە سوکایەتی و گاڵتەپێکردنیش ئەوە فێر ببین کە چۆن بەرەوپێشەوە بچین. ئەگەر لە ژیانی هاوسەریەتیدا، پەروەردەی منداڵ، پارە و متمانەدا، تێکشکایت، یاخود زیانێکی دەرونیت بەرکەوت، باش بزانە کە هەموو ئەمانە دەستمایەی تۆیە. چارەنوسی پیاوە گەورەکان بخوێنەرەوە. هەموو بەشێك لەمانە دەستمایەن بۆ سەرکەوتن. بەڵام کەسە ناسەرکەوتوەکان ئەمانە بۆ ئەوە بەکار دەهێنن و دەیانکەنە دەستمایە بۆ ئەوەی ستەمدیدەیی خۆیان نیشانبدەن، بەڵام مرۆڤی سەرکەوتو سود لەم شتانە وەردەگرێت بۆ سەرکەوتنی خۆی لەژیاندا. کەوابوو خاڵی یەکەم ئەوەیە کە لە هەر بەڵا و موسیبەت و کێشەیەك پێویستە ووزە وەربگرین و بۆ بازدان و تەکان بەرەو پلەی بەرزتر و باڵاتر سودی لێوەربگرین.

***

دەبێت ئەوە فێر ببین کە ئەم سەختیانە بنەمایەکن بۆ هەڵسەنگاندی جوڵەی دواتر. ئەو کەسەی کە بریندار بووە، ئەگەر ئازارشکێنێك بخوات، هێمن بونەوەکەی لە مرۆڤێکی تەندروست زیاترە! دەڵێت ئۆخەی ئیسراحەتم کرد، باش بومەوە! چێژ وەردەگرم. لەبەر ئەوەیە کە هێمن بوەتەوە و ئازارەکەیشی

کەمبوتەوە یاخود هەر نەماوە. دەبێت ئەوە فێر ببین کە نرخ و بەها بۆ کێشەکانمان دابنێین. وابیرنەکەینەوە کە ئەمانە بەڵاو موسیبەتن. بەڵکو ئەمانە دەستمایەی سەرکەوتنی مرۆڤەکانن. ئەو کەسانەی کە ئەمانە دەکەنە بیانو بۆ ئاراستەکردن و ماناداركردنی کاروبارەکانیان یاخود سەلماندنی کاروبارە هەڵەکان، بەدڵنیاییەوە ئەم هەلە لەدەست دەدەن. لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵناسی و چارەنوسی کەسایەتیە گەورەکاندا، ئەوەیان نیشانداوە کە هەموو مرۆڤە گەورە و سەرکەوتوەکان، ئاستی هۆرمۆنی خوێنیان بەرزە. ئەمانە حاڵەتێکی هێرشبەری (گەشە و بازدان) ئەزمون دەکەن. ئەوانەی کە زۆر سەرکەوتون، ئەم ووزەیە کۆنترۆڵ دەکەن و بۆ گەیشن بە گەورەیی ئاراستەی دەکەن. بەدەستی خۆمانە... کە ئەم ووزەیە کۆ بکەینەوە و بیگۆڕین بە ئیرادەیەکی پۆلایین بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستە گەورەکان (کە لەپێناویاندا خولقێنراوین) یاخود ئەوەی کە بە شتانێکی کاتیان بدەینە قەڵەم.

***

هەموو مرۆڤە گەورە و سەرکەوتوەکانی جیهان، یەکێك لە سیفەت و جیاوازیەکانیان کە پێی دەناسرێنەوە، بەلایەنی کەمەوە یەك بۆ سێ جار تامڵی زیانە قورسەکانیان کردووە و توانیویانە خۆیان ڕزگار بکەن. نیچە دەڵێت: (ئەوەی کە من نەکوژێت، ئەوا بەهێزترم دەکات). وەرن با ڕاهێنان بکەین. مەسەلەکانی ژیان نەك تەنها ئێوە ناکوژن، بەڵکو دەمانکەنە کەسانێکی ئاسنین و پۆلایین. ئەو



Scanned with CamScanner

منداڵانەی کە دایکوباوکی سەختگیریان هەیە، لەو منداڵانە سەرکەوتوترن کە لەلایەن دایکوباوکیانەوە بەناز گەورە کراون، چونکە گروپی یەکەم بۆ نیشاندانی خۆیان بەشوێن ڕێگەچارەدا دەسوڕێنەوە. بەڵام گروپی دوەم ئەوەندە سەرنجی زیادەیان پێدەرێت کە توانای هیچکارێکیان نییە و ئەمانە زیاتر شانسی موعتادبون و توشبونیان بە مادەهۆشبەرەکان هەیە. ئێمە ناڵێین زۆر سەختگیربین بەرامبەر بە منداڵەکانمان، بەڵام دەبێت کاتێکیشیان بۆ دابنێین کە ڕوبەڕوی کێشە و بەرەکانی ژیان ببنەوە. بۆ نمونە لەیاریگادا بەسەر تەلەکاندا بچێتە سەرەوە و کەمێك بوێری هەبێت و خۆی لە کێشە و بەرەکان ڕزگار بکات، بهێڵن بابکەوێتە سەرزەوی، خێرا مەچن بە هانایەوە. با ڕێگەبدەین و تامڵمان هەبێت و چاوەڕوان بین کە داوای یارمەتی بکات. کاتێك منداڵ تا دەیگرێت، یەکسەر دەرمانی پێمەدەن، کەمێك بوەستن بۆ ئەوەی جەستەی بەرگری پەیدا بکات، ئەگەر باش نەبوو، ئەوکات یارمەتی بدەن و دەرمان و چارەسەری بۆ وەربگرن. خۆ ئەگەر بێت و هەرکاتێك توشی تا هات و یەکسەر دەرمانی پێدرا، ئەوا هەرگیز بەرگری لەشی بێدار نابێتەوە. سەختیەکان دەستمایەی سەرکەوتنن. سەختی و ناڕەحەتیەکان سوتەمەنی ڕێگای سەرکەوتنن. بەپێچەوانەی ئەوەی کە بیری لێدەکەنەوە. بە پێچەوانەی ئەو فێرکارییانەی کە پێشکەشی منداڵەکانی دەکەین. باشە بۆچی دەچین بۆ شاخڕەوی؟ بۆچی وەرزش دەکەین؟ بۆچی ڕادەکەین؟ کاتێك ڕادەکەین،

هەستکردن بەزاڵبون بەسەر بەربەستەکاندا بۆمان دروست دەبێت و بەهێزتر دەبین.

***

با بێین و چاوەکانمان بشۆین و وەك هەلێك سەیری کێشەکانی ژیانمان بکەین. نەوەك وەك پەند و ئامۆژگاری. لەڕاستیدا ئەم کێشە و گرفتانە هەلی سەرکەوتنن، چونکە هێزو ووزەیەك لەناو ئێوەدا تەیار دەکەن کە ئەگەر بە ڕاست و دروستیەوە سودی لێوەربگیرێت، هەروەك کەسێکی جوملاستیك ئێوە بەرەو جوڵەی دواتر دەبات و دەتانخاتە قۆناغی دواتر... ئەوکات لەسەر میلەی ژیان بەردەوام هەڵدەسوڕێن و هەموانیش سەرسام دەبن لەم هێز و ووزەیەی ئێوە! دەبێت هونەرتان هەبێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم ڕەنج و ئازارەی ئێوە، دەبێت ببێتە خەزینە و گەنجینەی ئێوە...بەداخەوە! کە خۆتان پەردەن بەسەر گەنجینەکەی خۆتانەوە و ڕێگەنادەن خۆی دەربخات و ببینرێت...

# "گرنگ" بون یان "بەسود" بون، کامیانت دەوێت؟

لە شوێنێکدا ڕستەیەکی (لویی پاستور)م خوێندەوە کە گوتبوی: (عەیب و کەموکوڕی گەورەی کۆمەڵگەکان ئەوەیە کە هەموان دەیانەوێت مرۆڤانێکی گرنگ بن، بەڵام زۆر کەمن ئەو کەسانەی حەزیان لەوەیە کە مرۆڤانێکی بەسود بن!) بەڕاستی ڕستەیەکی بیرهەژێنە و مرۆڤ والێدەکات بیر بکاتەوە. کاتێك سەیری دەوروبەری خۆم کرد دەبینم بەتەواوەتی ئەم ڕستەیە ڕاستە. ئێمە لە پەروەردەی منداڵەکانمان، لە هەڵبژاردنی ئەو ڕێگایانەی کە هەڵیاندەبژێرین، لە جۆری ئەو ئیش و کارانەی کە ئەنجامیان دەدەین، هەموکات سورین و پێداگری لەسەر ئەوە دەکەین کە بە کەسانێکی گرنگ دەربکەوین. گرنگبون لە مرۆڤدا شتێکی زۆر کلیلیە. ئێمە پێویستمان بەوە هەیە کە هەستبکەین مرۆڤێکی گرنگین. بەڵام سەد هێندە باشترە ئەگەر بێت و کار لەسەر ئەوە بکەین کە لەڕێگەی بەسودبونەوە بگەین بە گرنگبون. هەموو مرۆڤێکی بەسود کەسێکی گرنگە، بەڵام مەرج نییە هەموو کەسێکی گرنگ مرۆڤێکی بەسود بێت بۆ دەوروبەرەکانی. هەموو پزیشکێکی



Scanned with CamScanner

عاشق، هەموو عاریفێکی عاشق، هەموو بەڕێوەبەر و مامۆستا و کەناسێکی عاشق، هەموو کرێکارێکی عاشق مرۆڤێکی بەسودە. بەڵام مەرج نییە هەموو پزیشك و هەموو مامۆستا و هەموو کرێکار و هەموو ئەندازیارێك هەر دەبێت بەسود بن. وەرن با چاوەکانمان بشۆین و بە جۆرێکیتر سەیر بکەین. منداڵەکانمان فێری ئەوە بکەین هەمیشە بەدوای ئەوەدا بگەڕێن کە هەموو ڕۆژێك و هەمو چرکەساتێك هەست بەوە بکەن کە مرۆڤانێکی بەسودن. لە ڕێگەی ئەوکارەی کە ئەنجامیدەدەن، هەستبکەن بۆ خۆیان و خەڵکی و کۆمەڵگە و وولآتەکەیان و هەموو خەڵکی دونیا کەسانێکی بەنرخ و بەهان.

***

با پرسیار لە خۆمان بکەین کە من دەتوانم چ کارێك ئەنجامبدەم، بۆ ئەوەی شارەکەم ئاوەدانتر بکەمەوە. دەتوانم چ کارێك بکەم کە ئێش و ئازارەکانی خەڵکەکەم کەم ببێتەوە. دەتوانم چ کارێك بکەم بۆ ئەوەی لەگەڵ دراوسێکانمدا کۆ ببمەوە و ئەنجومەنێك پێکبهێنین و شەقام و کۆڵانەکەمان پاکوخاوێن رابگرین و سەوزی بکەین. ئاسایش و ئارامی منداڵەکانمان بپارێزین و یارمەتی پۆلیس بدەین. ئەگەر سەرنج بدەن و ورد ببنەوە، ئەوکەسانەی کە لەژیاندا کاریان ئەمەیە-زۆرێك لە خاتونەکانم بینیوە کە لە گروپگەلێکی جیاوازی ئاینیدا کۆ دەبنەوە و جیازی و پێتەك بۆ ژمارەیەك لە کچانی دەستکورت ئامادە دەکەن و پارە کۆ دەکەنەوە و بەهەر شێوەیەك بتوانن یارمەتی خەڵکی دەدەن- کەسانێکی زۆر بەسودن و کۆمەڵگە

بەهۆی ئەمجۆرە کەسانەوەیە کە هێشتا توانیویەتی لەسەر پێیەکانی خۆی بوەستێت. هۆز و نەتەوەکان لەبەر ئەخلاق و ڕەوشتە جوانەکانیانە کە ماونەتەوە و هێشتا زیندون. واتە بەهۆی بەسودبون و بەهاکانەوەیە کە ماونەتەوە. چونکە هۆز و نەتەوەیەك کە ئەخلاقی نییە، بەدڵنیاییەوە هەر دەمرێت و ناوی لە تۆماری چاکە و جوانیەکانی مێژودا دەسڕێتەوە. وەرن با بیر بکەینەوە. ئەمانە مامۆستاکانی ئێمەن. لەوانەیە خودی خۆتان بەشێك بن لەم گروپانە. با بێین و یارمەتی بدەین. بەهاکان لە گرنگبون و بەناوبانگبونەوە بگوازینەوە بۆ بەسودبون. لەم دوونیایەدا دوو کەس دەبێت ئافەرینی ئێوە بکەن، هەر ئەمەش بەسە بۆ ئێوە. یەکەمیان خودا و دوەمیان خۆت. ئەگەر مرۆڤ پشتگیری خۆی کرد و لەگەڵ خۆیدا ئاشتەوایی کرد، ئەوکات تێدەگات کە خودا چەندێك پشتگیری ئەوی کردووە و چەندە ئەوی خۆش دەوێت. کاتێك لە قاموسی ژیانی مندا، عەشق و ڕێز نەبێت، ئەوکات هەرکەسێك عەشق و ڕێزی خۆیم بۆ دەربخات ناتوانم لێی تێبگەم. ئەمەش لەبەر ئەوە نییە کە من کەسێکی خراپم، بەڵکو تەرجەمەی دەستەواژەیەکی لەمشێوەیە لە قاموسی ژیانمدا بوونی نیە، هەربۆیە گومان دەکەم کە لەوانەیە مەبەستێکی هەبێت و بیەوێت بمخەڵەتێنێت.

***

نرخ و بەها لە بەسودبوندایە. بەسودبون بۆ خۆتان، خێزانتان، دەوروبەرەکانتان و دواتر شارەکەتان، دەتوانین لەوکاتەدا کە بۆ

خۆمان بەسودین، بۆ کۆمەڵگەکەشمان بەسود بین. با جیاوازی بۆچوونتان هەبێت، بەڵام یارمەتی یەکتری بدەن. کاکی خۆم بیر بکەرەوە بزانە چی بکەیت کە بۆ خاتونەکەت کەسێکی بەسود بیت و خاتونی بەڕێز تۆیش بە هەمانشێوە بیر بکەرەوە و بزانە کە دەتوانیت چی بکەیت بۆ ئەوەی بۆ هاوسەرەکەت وماڵەکەت خانمێکی بەسودتر بیت. بەڵکو دەبێت بیر لەوە بکەنەوە کە ئاخۆ چی بکەن بۆ ئەوەی بتوانن کەسانێکی بە سود و بەکەڵکتر بین بۆ هەموو دونیا. ڕێگەبدەن کە ڕۆڵەکانی ئێران بێن و بەشی خۆیان لە گەشە و بەرزی دوونیادا قبوڵ بکەن. نەوەك بەردەوام لەناو بازنەی خۆماندا بسوڕێینەوە و تەنها بمانەوێت بیر لەخۆمان بکەینەوە. دەتوانین ئەمکارە بکەین. دەتوانین زۆرێك لە بیرۆکە و پێشنیارەکان بخەینەڕوو، بەڵام بەومەرجەی کە لە ناوخۆماندا بێینە دەرەوە و خەم بۆ خۆمان نەخۆین و دڵسۆزی لە ڕادەبەدەر بۆ خۆمان نەنوێنین. کاتێك من بە شوێن (گرنگ)بونەوەم و تەنها ئەمەوێت خەڵکی سەرنجم بدەن و هەموو تیشکەکان بخرێنە سەر من، ئەوە مانای ئەوەیە کە من تینوی سەرنج و خۆشەویستی خەڵکانی دەوروبەری خۆمم، واتە خاوەنی سەرنج و خۆشەویستی نیم!

کەسێك کە لە خۆشەویستبونی خۆی دڵنیایە، ئەو کەسەی کە بەدڵ دەزانێت نیەتی چۆنە و ئەیەوێت خزمەت بکات، بەباشی خزمەت دەکات. ئەگەر ئافەرینیان کرد و هانیاندا، ئەوە باشتر. خۆ

ئەگەر ئافەرینیان نەکرد و هانیان نەدا، لەبەر ئەوە بووە کە عەقیدە و فیکرییان ئەمەبووە.

***

با بێین و ئەم قسەیەی لویی پاستوی بکەینەوە. با کۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەیەك بێت کە نرخ و بەها بەوە بێت کە گرنگی مرۆڤ بەهۆی بەسودبەنەوە بێت نەوەك بە هۆی ئیش و کار و پلەو پایەوە.

***

بافێری ئەوە ببین کە بەهاکانی ژیانمان لەسەر بەسود بون دابنێین. هەر ئەوەی کە ئێوە لەبیرو زەینتاندا بڕیارتان دا و ئەمەتان لەژیانی خۆتاندا پیادە کرد، ئەوە مانای ئەوەیە کە هەستتان کردووە بەها پەیوەستە بە بەسودبونەوە، ئەوکات دەبینن کە وردە وردە تیشك و روناکیەکانیش دەخرێتە سەر ئێوە و هێدی هێدی پیت و بەرەکەت بەرەو لای ئێوە دێت و بە شێوەیەکی هێمن و لەسەرخۆ دەرگاکان بەڕوتاندا دەکرێنەوە و خەڵکی گرنگیتان پێدەدەن. لە ژیاندا سەیری ژیاننامەی پیاوە گەورە و مەزنەکانمان بکەن. ئەوانەیان لە بیرەوەری و یادەوەرییەکاندا دەمێننەوە کە سود و کەڵکیان بۆ خەڵکی هەبێت و کاریگەر بن لەسەریان. لەبیرتان بێت بۆ ئەم کاریگەربونەش پێویست ناکات کارێکی لە ڕادەبەدەر بکەین. هەر ئەوەی کە بە هاوسەر و منداڵ و شارەکەماندا ڕابگەین، هەر ئەوەی کە لە خەو هەستاین، داوا لە خودای گەورە بکەین یارمەتیمان بدات، ئێش و ئازاری کەسێك کەم بکەینەوە، ببینە

مرۆڤێکی بەنرخ و بەهاتر، ئەمە بەسە بۆ ئێمە. لە سیمیناری (شاد بن و دەوڵەمەند ببن)، لە برگەیەکیدا ئەوەم گوت کە دەوڵەمەندبون ڕێگەیەکی زۆر سادەی هەیە، ڕێگە سادەکەیشی ئەوەیە کە بڵێن: (خودایا یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی من بۆ مرۆڤ و بەندەکانی تۆ مرۆڤێکی بەسود و کاریگەر بم. ڕۆزی ژمارەیەك لە بەندەکانی تۆ لەلایەن منەوە دابەش بکرێت) ئەگەر ئێوە لە خودا پاڕانەوە و گوتتان ڕۆزی ١٠ کەس یان ڕۆزی ١٠٠ کەس یاخود ڕۆزی خێزانەکەم و ڕۆزی خۆم، بخەرە بەردەستم، ئەوا خودای گەورە بە هەمان ئەندازەتان دەخاتە بەردەست.

***

لە دەزگای خێرخوازی (مەحەك)دا خاتونێك پرۆژەیەکی دانا و کارێکی دەستپێکرد. ئەوانیتریش هاتن. مرۆڤە خێرخوازەکانیش هەن، بەڵام دەبێت ئەم کەسانە متمانە بە سیستەمێك بکەن و لە دروستکاری دڵنیا ببنەوە، بۆ ئەوەی بێنە مەیدانەوە. هەمیشە داوا لە خودا بکەن کە ڕۆزی ژمارەیەکی زۆر لە بەندەکانی خۆی بەهۆی ئێوەوە دابین بکات. ئێوە پێشکاری و وەکیلی خودا بگرنە ئەستۆ. دڵنیابن کە زۆر دەوڵەمەند دەبن. بڵێن: (خودایا! یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی خۆشی ژمارەیەکی زیاتر لە خەڵکی لەلایەن منەوە بەدی بهێنرێت). لەوانەیە هونەرمەند، یان نوسەر، یاخود زانایەك بیت، بەڵام دەبینیت بە بەراورد بە کاتێك کە تەنها داوای ڕۆزی خۆت بکەیت و یان داوا لە خودا بکەیت کە تەنها یارمەتی تۆ بدات تاوەکو

بگەیت بەم ئیش و پلە و مەقامە، چەندە کاریگەریت لەسەر کەسانی دەوروبەری خۆت دەبێت، ئێوە هەرچیەکتان بوێت خودا پێتانی دەبەخشێت، بەلاّم کلیلی ئاڵتونی بەختەوەری و خۆشبەختی، لە هەستکردن بە ڕازیبون لە خود و متمانە بە خۆبوندایە. تۆ کاتێك لە خۆت خۆشحاڵ دەبیت و متمانەت بەخۆت دەبێت، کە هەستبکەیت مرۆڤێکی بەنرخ و بەهایت. ئێوە بینیوتانە کاتێك پارەیەك دەکەن بەخێر بەبێ ئەوەی کە هیچکەسێك بزانێت، ئەو حاڵەی کە بۆتان دروست دەبێت، هەست و حاڵێکی زۆر جوان و خۆشە. دەزانن بۆچی؟ چونکە لەنێوان گرنگبون و بەسودبوندا، بە سودبونتان هەڵبژاردووە...!!

***

یەکێك لە خزمە نزیکەکانم دەیگێڕایەوە کە ساڵانێك لەمەوبەر، لەناو تەکسیەکدا بوم. کابرایەك زۆر هات و هاواری بوو بەدەست بێ ئیش و کاری و بەتاڵیەوە دەینالاّند. کاتێك گوێم بۆ گرت، لەناو قسەکانیدا ڕاستگۆیی و ڕەسەنایەتیم بینی. هەروا بۆڵەی دەهات و بێزار و بێتاقەت بوو. منیش لە کوشنی دواوەی سەیارەکەدا دانیشتبوم. دەستمکرد بەناو گیرفانمدا هەرچیەك پارەم پێبوو (کەمیش نەبوو) زۆر بە هێمنیەوە، پارەکەم کرد بەناو گیرفانیدا. ئەویش بەکارەکەی نەزانیم. من دابەزیم و ڕۆیشتم. ئەو منی نەبینیەوە و منیش ئەوم نەبینیەوە. بەلاّم ئێستە کە ئێوە ئەم داستان و بەسەرهاتە دەخوێننەوە، چەندێك حاڵتان دەگۆڕێت،

چەندێك دەكەونە ژێر كاریگەرییەوە. تاوەكو ئەوەی كە بەئاشكرا بڵێم كاكە من هاوكاری و دەستگیرۆیی هەژار و نەدارانم كرد. كامیان كاریگەرییان زیاترە لەسەر دڵ و دەرونی ئێوە؟ دەی دیارە ئەوەیان كە بە نهێنی كراوە و خێرۆمەندەكەی بێناوونیشانە. دەبێت ئەوەی كە هەڵیدەبژێرین بەسود و كاریگەر بێت نەوەك گرنگ. دڵنیابن هەر بەم ئاسانیە خۆشبەختی و بەختەوەری بەرەو پیرمانەوە دێت. با بڕیار بدەین. بڕیار بەدەستی من و ئێوەیە. سەروەت و سامان مافی ئێوەیە، ناووشۆرەت مافی ئێوەیە، ڕێز و ئیحتیرام مافی ئێوەیە، بەلام ئەگەر بەڕێگە ڕاست و دروستەكەیدا بۆی بڕۆن كە لەپێناویدا خەلق كراون، ئیتر چ شیعر بێت یاخود ئەدەبیات و ئەندازیاری و پزیشكی و كرێكارییش. ئەوكات بەچاوەكانی خۆتان دەبینن كە چەندە حاڵتان باش دەبێت. ئەمەش باشترە بیكەن تاوەكو ئەوەی كە ئیرەیی ببەنە و بڵێن ئەگەر فێری بكەم پێشم دەكەوێت. لەم حاڵەتەدا لەوانەیە نمرەی ١٠٠ وەربگریت بەلام كەسێكی خۆشبەخت نیت.

***

با هەڵبژاردەی یەكەممان بەسودبون بێت. ئەوكات گرنگبون وەك دەرئەنجامێك خۆی بەدوایدا دێت. دەبێت بزانین كە گرنگبون هەستێكە لە ناخی ئێمەدا و پشتگیرییەكە لەلایەن خودای گەورەوە بۆ ئێمە. كاتێك بەسودبون هەڵبژێرن، ئەوكات هەردوكیان بە شێوەیەكی ڕوون و ئاشكرا و دیار دەبینن. ئەمەش هەستێكە كە هیچ

کەسێك ناتوانێت بە ئێوەی بدات یاخود لە ئێوەی بسەنێتەوە. کاتێك خۆت لە دڵی خۆتتدا دەزانیت کە چ کارێکت کردوە و چ نیەت و مەبەستێکت هەبووە و هەقدەستەکەیشت وەرگرتوە، ئەوکات بۆ خۆت دەبیتە پیاوێکی ئازاد و ژنێکی ئازاد و گەنجێکی ئازاد.

# دونیای ئێمە بەم (جیاوازیانەوە) جوانترە

لەو گەڕەکەی کە من لە (ڤنکوور)دا دەژیم، شوێنێك هەیە بەناوی SEAWAIK کە لەکەناری ئۆقیانوسدایە و شوێنێکە بۆ گەڕان و پیاسە کردن. ڕۆژێکیان لەوێدا پیاسەم دەکرد، هەوایەکی خۆشی هەبوو. دەبینم کورسیەکان بەناوی کەسانێکەوەیە کە بەدیاری بەخشیویانن بە خەڵك و شارەکە. هەروا کە پیاسەم دەکرد، ئەو بیرۆکەیەم بۆ هات کە منیش نەمامێك بچێنم، بۆ ئەوەی یادگاریم لەم شوێنەدا هەبێت و دواتر گەشەکردنەکەی ببینم. تۆوێکم هەڵبژارد کە دواتر دەبویە درەختێکی زۆر باش، هاتم و شوێنێکی چۆڵم دۆزییەوە. هاتم بۆ ئەوەی زەوییەکە هەڵبکەنم و تۆوەکەی تێدا بچێنم. کاتێك ویستم تۆوەکە بچێنم دەبینم چیمەنێکی یەکدەستی زۆر جوانە. درەختێکی گەورە و قایمیش لەوێدا بوو. دەبینم ناکرێت. دەتانەوێت بزانن بۆچی؟ دەبینم ئەگەر من ئەم تۆوە بچێنم، پاش ماوەیەك ئەم تۆوە سەر دەردەهێنێت و دەستدەکات بە لق و پۆپ لێدان، هەرکە لق و پۆپەکانی لەناو خاکەکەدا هاتنە دەرەوە و لە سنورێك بەرزتر دەبنەوە، مەکینەیەکی چیمەنبڕین دێت و سەرەکەی دەقرتێنێت. لێرەدا چیمەن هەیە و هەموو گژوگیاکان یەکدەستن. نەمامەکە هەوڵ

دەدات کە دووبارە گەشە بکاتەوە و بەرز ببێتەوە. بۆ جاری داهاتو کە مەکینەی چیمەنبڕینەکە بێت بۆ ئەوەی چیمەنەکە ببڕێت، ئەمیش دەقرتێنێت، بەدڵنیاییەوە ئەم نەمامەش ماندو دەبێت، چونکە سروشتەکەی وەك چیمەن نییە و کورت بێت. بەڵکو سروشتی درەخت بەرزی و ئازادی و سەربڵندیە. هەربۆیە درەختێکی ئازاد و بەرزیش ناتوانێت لەناو چیمەندا گەشە بکات.

***

بیری ئەو شوێنانەم کەوتەوە کە ئێمە تێیاندا گەورە دەبین. ئارەقێکی ساردم کرد. هۆکاری ئەو ئارەقەی کە هەستم پێکرد، ئەوەبوو هەستم کرد چەندە زۆرن ئەو منداڵانەی کە بە توانان و خاوەن لێهاتنن، کە لەشار و خێزانگەلێکدا گەورە دەبن کە تێیاندا مەکینەیەکی چیمەنبڕ، بەناوی ڕۆشنبیری، بەناوی نەریت، بەناوی پەروەردە و بەناوی قوتابخانە و زانکۆوە هەیە کە هەموو تواناکانی ئەمانە لەناو دەبەن. بەهیچ شێوەیەکیش گرنگی بەوە نادەین کە ئەم درەختە بەرزە و ئەویان مامناوەندە و ئەویتریان سێبەری هەیە. ئەم منداڵە دەبێت ببێتە مۆسیقار، ئەویان شاعیر و ئەویتریان فەیلەسوف و ئەویتریش داهێنەر و....هتد، ئەمانە زۆر لەیەکتری جیاوازن. ئەم مەکینەیە منداڵەکانی ئێمە دەباتە ناوەوە و هەمویان بەشێوەیەکی یەکسان و یەکدەست دەداتە دەرەوە. هەمویان بڕوانامەی بەکالۆریۆس و ماستەر و دکتۆراو....هتد وەك یەك بەدەست دەهێنن!

***

ئازیزانی من، با ساتێك بوەستین و سەرنج بدەین، کە لەژێر ناوی پەروەردە و لەژێر ناوی دیدگا کۆمەڵایەتیە باوەکاندا، چ بەڵایەك بەسەر خۆمان و خەڵکیشدا دەهێنین. هەرهەمومان ئەمانەوێت ببینە ئەندازیار و پزیشك. بەبێ ئەوەی کە سەرنج بدەین بۆچی خەلق کراوین و ئافرێنراوین. بۆچی دروستکراوین؟ باشە ئەم منداڵەی من بۆچی ئافرێنراوە؟ لە چیدا بەتوانایە و پەیامی بۆ دونیا چیە؟ پەیامی من و ئێوە بۆ دونیا چیە؟ ئێمە مرۆڤین. دەبێت بتوانین ڕێز لە جیاوازییەکان بگرین. دەبێت جیاوازییەکان قبوڵ بکەین. ناکرێت و نەگونجاوە کە ئێوە لەناو دونیای سروشتدا شوێنێك بدۆزنەوە کە چیمەنێکی دەستکرد بەبێ مرۆڤ سەوز بوبێت و دروستکرابێت، ئەمانە هەمویان دروستکراوی دەستی ئێمەن، گیایەکی ٢٠ سانتیمەتر و ئەویتر ٥٠ سانتیمەتر بەرز دەبێتەوە. سروشتیان جیاوازی هەیە و جوانی دونیاش بەم شتانەوەیە. جوانی دونیا بەوەوەیە کە من و ئێوە جیاوازیمان لەگەڵ یەکتریدا هەبێت، دیدگای جیاوازمان هەبێت. دەبێت فێر ببین کە ڕێز لەیەکتری بگرین. من نەمەوێت ئێوە وەك من بن و ئێوەش نەتانەوێت منیش وەك ئێوە بم. دەبێت فێر ببین کە ئەم جیاوازیانەن جوڵەی ژیان بەدی دەهێنن. ئەم جیاوازیانەن کە جوانی دەخولقێنن. منداڵی یەکەم و دوەمتان لەگەڵ یەکتریدا جیاوازن. هەمومان لەیەکتری جیاوازین، هەرچەندە مرۆڤین و یەك گەوهەری ئیلاهیش لەناخماندایە. ئەگەر بڕیاربوبێت کە هەمومان وەك یەك بین

و وەك یەك بیر بكەینەوە و وەك یەك بجولێینەوە، ئەوكات دونیا
دەبویە شوێنێكی زۆر بێتام و بێمانا.

***

بیری لێبكەنەوە كە بۆ نمونە هەر ئەمڕۆ یان هەر ئەمشە و لەماڵەوە
بچنە دەرەوە و هەموو خەڵكی لەسەر شێوەی موكەعەب و لاكێشەیی
بن! لە تەنیشت یەكەوە بەجوانی ڕێكخرابن و لەتەنیشت یەكەوە
وەستابن و هەمویان وەك یەك قسە بكەن و وەك یەكیش بیر بكەنەوە.
هەموان یەكسان بن. باشە ئێوە حەز دەكەن لە ژیانێكی ئاوادا بژین؟
من وەك خۆم حەزم لێی نییە! باوەڕیش ناكەم هیچ مرۆڤێكی ئاقڵ
حەز بەو ژیانە بكات. چونكە بەڕاستی ژیانێكی زۆر بێزاركەر و
ماندوكەرە. یەكێك قەڵە و ئەویتر لەڕو لاوازە، یەكێك باڵابەرزە و
ئەویتر كورتە باڵایە. ئەم جیاوازیانە زۆر جوانن، ئەو هۆزو نەتەوانەی
كە بەهۆكاری ڕۆشنبیری و داب و نەریتیانەوە، تەنها لەناو خۆیان ژن و
ژنخوازی و هاوسەرگیری دەكەن، بە تێپەڕینی كات وەچەیان بەرەو
لەناوچون و پوكانەوە دەچێت. نەخۆشی بۆماوەیی و جینایەتی
زۆریان هەیە، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی كە خوێنێكی تازە و نوێ ناچێتە
ناو جەستەیانەوە. ڕێك بە پێچەوانەی ئەمانەوە، ئەو هۆزو نەتەوە و
تیرانەی كە لە هۆز و نەتەوەگەلی جیاواز پێكهاتون، خەڵكانێكی
هۆشیار تر، تەندروستتر و پایەدارتریان هەیە و نەوەو وەچەیان
دەمێنێتەوە و لەناوناچێت. با بێین و بەیەكەوە و بۆ یەكجار
چاوەكانمان بشۆین. با ئەم بیركرنەوەیە بگۆڕین كە داوا لە

هاوسەرەکەم بکەم (ئازیزەکەم تۆ دەبێت وەك من بیر بکەیتەوە) یاخود داوا لە منداڵەکەم بکەم وەك من بیر بکاتەوە. من دەتوانم باسی شێوازی بیرکردنەوەی خۆم بکەم و دەبێت ڕێگە بدەم کە بەرامبەرەکانیشم باسی بیرو بۆچون و شیوازی بیرکردنەوەی خۆیان بکەن. باسی داب و نەریتی نانخواردن و داب و نەریتی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری خۆم بکەم، ئەمە هیچ کێشەیەکی تێدا نییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ڕێگەبدەم کەسانی دەورووبەریشم باسی خۆیان بکەن. لە فەرمانگەیەکدا بەڕێوەبەری باش ئەو کەسە نییە کە هەموان گوێڕایەڵی لێبکەن و هەموان وەك یەك بن. بەڕێوەبەرە شیاوو باشەکانیش ئەمە باش دەزانن. دەبێت فێرببین کە ڕێز لە جیاوازییەکان بگرین، ئەم جیاوازیانە لە سەلیقە جۆراوجۆرەکانیشدا بوونیان هەیە.

***

لەبەر خۆمەوە گوتم ئەم جوانکارییانە چەندە کارێکی بێهودەیە و چەندە بێمانایە کە ئەم خەڵکە پارە لە شتە سەیر و سەمەرەکاندا خەرج دەکەن. بەڵام دیسانەوە بەخۆمم گوت موعەزەمی باشە ئەی تۆ خۆت ناڵێیت دەبێت ڕێز لە جیاوازییەکان بگیرێت؟! باشە نرخ و بەهای ئەم مرۆڤانە بەم داب و نەریتە سەیروسەمەرانەیانەوە لە چیدایە؟ بە بڕوای من ئەم مرۆڤانە پارە بۆ شتە سەیروسەمەرەکان خەرج دەکەن، بۆ فەرش و قاڵی و تابلۆ و کورسیە گرانبەهاکان پارە دەدەن، بەمشێوەیە هونەرمەندان ڕۆزی ڕۆژانەیان پەیدا دەکەن و

خەڵکی لە هونەرەکەیان ڕازی دەبن. من حەزم لەوە نییە، باشە دەی با حەزم لێی نەبێت، بەڵام خۆ ئەمە نابێتە بەڵگە کە شێوازی من، ببێتە نەریت و شێوازی هەموان. ئەو شێوازە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو کەسانەی حەزیان لەشتە سەیرو سەمەرە و ئامێرە پێشکەوتوە ئەلەکترۆنیەکانی وە کۆمپیوتەرە پێشکەوتوەکانە، پارەیەکی زۆر بدەن بۆ ئەوەی ئەم سیستەمانە بکڕن. کارگە و پیشەسازەکان، بەم پارانە ئەمانە دروست دەکەن و بەرهەمهێنان بەرز دەبێتەوە و ڕۆژێك دێت کە نرخی تەواوبوی ئەم سیستەمانە دادەبەزێت، ئەوکاتەیە کە ئێمەش دەتوانین ئەو شتانە بکڕین. ئەمە لەکاتێکدایە کە تێچوی دروستکردن و داهێنانیان خەڵکانێکیتر داویانە کە نوێگەر بون. ئەوانە نرخ و بەهایان هەیە. دەبێت ڕێزیان لێبگرین. هەروەك چۆن ئەو مرۆڤانەش بە سادەییەوە دەژین نرخ و بەهای خۆیانیان هەیە.

***

ڕێگەبدەن داستانێکتان بۆ بگێڕمەوە: کاتێك لە ئامادەییدا بوم، ژینگەناسێك باسی بۆ دەکردین. کاتێك نزیکی ڕۆژانی جەژن دەبویەوە، منداڵان چەند ڕۆژێك لە قوتابخانە پشویان هەبوو، ڕێگەیان پێدەدرا کە بۆ بەرزڕاگرتنی نەورۆز ئاهەنگێك بگێڕن و ڕێگەشیان پێدەدرا کە لاسایی مامۆستاکانیان بکەنەوە. یەکێك لە قوتابییەکان بەمامۆستای گوت: مامۆستا موعەزەمی دەتوانێت بێت و لاسایی تۆ بکاتەوە؟ ئەم مامۆستایەش زۆر حەزی نەدەکرد کەس لاسایی بکاتەوە. قسەیەکی زۆر جوانی کرد کە تاوەکو ئێستەش لەبیرم ماوە،

گوتی: (باشه با لاسایی من بکاتەوە، وەك خۆمی لێدێت، لەکاتێکدا خۆیشم لێرەدا دانیشتوم!) ئەڵبەتە بەم قسەیە لە بابەتەکە چویە دەرەوە، بەڵام من لەو مامۆستایەوە شتێك فێر بوم. قسەکەی زۆر ڕاست بوو. ئەگەر بمانەوێت خەڵکانیتر وەك ئێمەیان لێبێت، ئەوکات دەبنە هاوشێوەی ئێمە. ئێ باشە، خۆ ئێمە خۆمان ماوین و هەین! هەربۆیە نابێت داوا لە هیچکەسێك بکەین کە وەك ئێمە بن. ئێوە وەك خۆتان بن و خەڵکانیتریش لە شوێنی خیاندا قبوڵ بکەن. ئێوە ئیشی خۆتان بکەن و ئەوانیش با ئیش و کاری خۆیان بکەن، ئەو ڕێکخراوو خێزانانەی کە ڕێگە بە جۆراوجۆری بیروڕا دەدەن، زۆر پایەدار ترن. لەمجۆرە خێزانانەدا منداڵان و هاوسەرەکان کەمتر دەخەڵەتێن و زۆر بە کەمی کاریان دەگاتە جیابونەوە. لە فەرمانگە و کۆمەڵگەکانیشدا بەهەمانشێوەیە. لە فەرمانگە و ڕێکخراوو دامودەزگا ئابوریەکاندا کە ئەندامان و کارگێڕەکان قسە دەکەن و ناترسن لەوەی کە خۆیان بن، ئەو فەرمانگە و نوسینگە ئابورییە دەمێنێتەوە. هەروەها بۆ وواڵات و شارەکانیش بەهەمانشێوەیە.

***

با بێین و ڕێز لە خواستی خودا بگرین، ڕێز لە جیاوازییەکان بگرین. جیاوازییەکان بە بەها بزانین و بەخۆمان بڵێین کە: (من وەك دیاردەیەکی ئەرێنی ئیلاهی سەیری جیاوازییەکان دەکەم و منیش یەکێکم لەو دیاردانە). یارمەتی یەکتری دەدەین بۆ ئەوەی دوونیا ببێتە شوێنێکی باشتر بۆ ژیانی هەموو خەڵکی.

# ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی: (برینێکی کۆنم هەیە)

یەکێك لەو کەرەستانەی کە لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان ونێوان تاکەکاندا زۆر گەشەی کردوە و گەشەو پێشکەوتنێکی زیاتریش بە خۆیەوە دەبینێت، بریتیە لە کورتەنامە یان SMS ئیتر چ لە قاڵب و چوارچێوە کۆن و کلاسیکیەکەیدا و چ لە قاڵب و چوارچێوەی ئەپڵیکەیشنەکانی پەیوەندیکردندا. دەتوانم بڵێم ڕۆژ نییە کە من ١٠ بۆ ٢٠ کورتەنامەم لە ئازیزان و خۆشەویستانەوە پێنەگات، کە نوکتە، پەیامە بەنرخەکان، هەواڵ، ڕاپۆرت و هاوشێوەی ئەمانەیان تێدایە، ئەمەش هۆکار و کەرەستەیەکی زۆر باشە. یەکێك لە هاوڕێیانم کورتە نامەیەکی بۆ ناردبوم کە: (من حاڵم زۆر خراپە، دڵتەنگ و ماندوم، ئەمەوێت تۆ ببینم) منیش عەرزم کرد کە ببورە من ئێستە لە سەفەرم و ناتوانم بتانبینم، کێشەکەت چیە؟ دواتر بە دوو بۆ سێ کورتەنامە کە لەنێوانماندا گۆڕدرانەوە، ڕستەی کۆتاییان ئەمە بوو کە(برینێکی کۆن لەسەر دڵم هەیە) منیش وەڵامێك بۆ نارد، کە وەڵامی ئەم هاوڕێ ئازیزەم، دەکەمە بابەتی ئەم یاداشتە.

***

برینی کۆنە چیە؟ برینێك کە تیمار نەکراوە. برینێك کە ئەگەر بیەوێت تیماریش بکرێت، بەڵام دوبارە برینێکی نوێیان لەسەر دروستکردوەتەوە. یاخود خەریکبوە باش ببێتەوە، برینەکەیان هەڵکەندوە و دووبارە خوێنی لێهاتوەتەوە و تازە بوەتەوە. ئەمەیە برینی کۆنە، کە برینێکی خراپ و مەترسیداریشە. با بزانین چ کەسێك ئەم برینە بە کۆنەیی دەهێڵێتەوە؟ با بێین و برینی سەردڵمان دەربهێنین و بیخەینە سەر جەستەمان. بابزانین چ کەسێکە کۆنەی دەکات؟ باشە چۆن برینێك کۆنە دەبێت؟ کاتێکە کە گرنگی پێنەدەین و پێیدا ڕانەگەین. کاتێك هۆکارە بەدیهێنەرەکەی لەناو نەبەین. یان کاتێك کە خۆمان ببینە ڕێگر لەبەردەم چاکبونەوە و سرەوتنیدا. خۆی خەریکە باشدەبێتەوە، بەڵام ئێمە ڕێگە نادەین. باشە کێ هۆکاری ئەمەیە؟ هەر خۆمانین. هیچ برینێك کۆنە نابێت، مەگەر ئەوەی کە خاوەنەکەی خۆی بیەوێت. منیش کورتەنامەیەکم بۆ ئەو هاوڕێیەم نارد : (هیچ برینێکی کۆنە نابێت، مەگەر تۆ خۆت ئەوەت بوێت)

***

هاوڕێ گیان، ئەگەر برینێك لە دڵتاندا هەیە، لەبری ئەوەی کە هەست بە ستەمدیدەیی یاخود خەڵەتان بکەن، لەبری ئەوەی کە بیر لەوە بکەنەوە چ کەسانێك و لە چ ڕۆژێکدا ئەم برینەیان لە ئێوەدا بەدیهێناوە (ئەم برینە کۆنەیەش بەزۆری یان ڕق و کینەیە یاخود زویربون)، بیری خۆتانی بهێننەوە و بڵێن (ئەرك و لێپرسراویەتی ئەم برینە لە ئەستۆی مندایە). منم کە ئەم بریەم هەیە، زیانم پێدەگات،

نەوەك ئەو کەسەی کە برینەکەی دروستکردوە ! لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕۆژە کە برینی ناوبراو بەدیهاتوە، دیسانەوە خودی خۆم لەو بەدیهاتنەیدا پشك و بەشم هەبوە. ئێمە حەزدەکەین بیر بکەینەوە، خەڵکانیتر لێپرسراون. بەڵام باوەڕ بکەن کە ژیان هەڵبژاردن و بڕیاردانە. هەموو کات و ساتێك دەبێت ئەوە بچپێنین بە گوێی خۆماندا کە: (ئەوە منم بڕیار دەدەم ئەم برینە بمێنێتەوە یان نا. ئەوە منم کە بڕیار دەدەم ببەخشم یاخود ڕق و کینەکان لەدڵمدا بهێڵمەوە. ئەوە منم کە بڕیار دەدەم ئاوو کوتی کیمیایی بکەمە بنی درەختی ڕق و کینە و نەفرەتمەوە، یاخود لە ڕەگ و ڕیشەوە دەری بهێنم. ئەوە هەر منم کە بڕیار دەدەم کات و ووزەم لەچ شتێکدا سەرف بکەم. لە ڕق و کینە و ئینکاریی و کۆنە قینەکاندا سەرفی بکەم، یاخود لە عاشق بون و داهێنانکاری و سازندەیی و میهر و خۆشەویستیدا سەرفی بکەم).

***

ئەوەمان لەبیر بێت کە زۆرێك لە خەڵکی فەیلەسوف ئاسا سەیرێکی خەمبارانە و داماوانەی ئێوە دەکەن و باسی برینە کۆنەکانی خۆیان لەگەڵ ئێوەدا دەکەن. لەوانەیە جگەرە بکێشن یاخود توشی مادەی هۆشبەر ببن، بەڵام کاتێك قسەیان لەگەڵدا دەکەیت بڵێن: (تۆ نازانیت، من چی دەچێژم، من ئازارێکی زۆر قوڵم هەیە...) من عەرزی ئێوەی دەکەم کە ئەمە بەهیچ شێوەیەك بەها نیە. بەڵکو بەها بریتیە لە ژیان بە شادی و کامەرانیەوە. بەها بریتیە لە شادومان کردنی خەڵکی. بەها بریتیە لە دروستکردن و بنیاتنان. بەها بریتیە لە باشبونەوە و

مانەوە، نەوەك شكاندن و ڕوخاندن. ئەمەش پەیوەستە بە بڕیاری بوێرانەی من و ئێوەوە، سەبارەت بە خۆمان، هاوسەرمان، منداڵەكانمان. شارەكەمان، كۆمپانیاكەمان، وولاتەكەمان و هەموو دونیا... ئەوە بڕیاری من و ئێوەیە كە دوونیا بكەینە شوێنێكی باشتر، یان شوێنێكی خراپتر. ئەوە بڕیار و هەڵبژاردنی ئێمەیە كە خۆڵ و خاشاك بڕژێنینە شەقامی بون و وجودی خۆمانەوە یاخود نەیڕێژین، ئەگەریش ڕژاندومانە، بە خێرایی كۆی بكەینەوە. بەلایەنی كەمەوە دەتوانیت یەكێكیان كەم بكەیتەوە. ئەم خۆڵ وخاشاكانە دەتوانن لە ژینگەكەتدا بن یان لەناو دڵتدا. هەرگیز شانازی مەكەن بە خەموخەفەتەكانتانەوە. ئەوە هیچ كە شیاوی شانازیكردن نیە، بەڵكو نیشاندەری لاوازی ئێمەیە. وەك ئەوە وایە كە من بڵێم دەستم بریندار بوە و باش نابمەوە. ئەگەر پزیشكی پسپۆڕ من ببینێت، یەكسەر لێم دەپرسێت (باشە بۆچی تیماری ناكەیت؟ ئەگەر برینێك باش نابێتەوە، بەدڵنیاییەوە نیشانەیەكی مەترسیدارە. لەوانیە بەرگری خوێنت كەم بێت یاخود خوێنت ژەهراوی بوبێت، كورە هەر لەوانەیە خودا نەكردە شێرپەنجە بێت).

***

هیچ برینێكی كۆن نییە كە لەڕوی پزیشكی و تەندروستیەوە، ببێتە هۆی نرخ و بەها بۆ خاوەنەكەی. هەموو برینێكی كۆنە، نیشانەی گرنگینەدان و پشتگوێخستن و ڕەچاونەكردنی تەندروستی و چارەسەر نەكردنە، هەربۆیە بە زیندویی و بەتەڕو تازە هێشتنەوەی ئەو برینە

هیچ نرخ و بەهایەك بۆ خاوەنەکەی زیاد ناکات و بگرە دژە بەهایشە. دەبێت بتوانین و فێر ببین کە مەسەلە و کێشەکان بە هەموو بون و وجودمانەوە قبوڵ بکەین. ئەمە بەشێکە لەژیان. من کە ئێستە خەریکم ئەم یاداشتە بۆ ئێوە دەنوسم، هەر ئێستە زیانێکی دەرونیم لە بابەتێکدا بینیوە. بەڵام هیچ هۆکارێك نیە کە من هەموو ئەمشتە زاڵبکەم بەسەر بون و وجودی خۆمدا، بابەتەکەم بەباشی و بە کاریگەری نەنوسم، کاتی و ئێوەیش و خۆیشم بە فێرۆ بدەم، یان بەدڵی شکاوەوە قسە بکەم. ژیان هەر ئەمەیە و من هەڵدەبژێرم کە کامە بەرهەم هەڵگرم. زۆرێك لە خەلکی بەرهەمی خراپ هەڵدەبژێرن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە لەو سیناریۆیەی کە بۆ ژیانی خۆیان نوسیویانە پێویستیان بەوە هەیە کە هەست بکەن بەدبەخت و چارەڕەشن.

***

شادی بەهایە. شادومان بون بەهایەکی باڵاترە. با هەوڵبدەین بتوانین خەڵکانیتر شادومان بکەین. خودی ژیان ئەوەندە مەسەلە و کێشەی هەیە کە ئەگەر جڵەویان نەگرین دەمانخۆن. دەبێت فێر ببین کە ئازایانە بژین. دەبێت فێر ببین و منداڵەکانیشمان فێری ئەو ئازایەتیە ببین. ئەو شتەی کە دەتەوێت بەدەستیەوە بناڵێنیت بریتیە لە بەهای ژیان، هەروەك پێشتر عەرزم کردبون: چەندێك لە نانخواردن چێژ وەردەگرن؟ پەیوەندی بەوەوە هەیە کە چەندێك برسیتان بێت. لە ئاوخواردنەوە چەندە چێژ وەردەگرن؟ پەیوەندی بە ئاستی تینویەتی خۆتانەوە هەیە.

***

مەسەلە و کێشەکانی ژیان هەمان ئەو ئیشتیها و حەزەیە، چارەسەریان دەکەن و خۆشحاڵ دەبن. لەناو ئێوەدا هێزێك بۆ چارەسەری کێشەکان بەدی دەهێنێت کە خۆشحاڵتان دەکات. ئەوکارانەی کە ئێمە ئەنجامیان دەدەین. هەمیشە بریتیە لەچارەسەری مەسەلەکان، ئێمە ناتوانین دڵمان بەنەبونی کێشە و مەسەلە خۆش بکەین. بەڵکو ئێمە دەتوانین لە چارەسەری مەسەلە و کێشەکان و لە پێشکەوتن خۆشحاڵ بین؛ ڕاستیەکەیشی هەر ئەمەیە. بەداخەوە هەندێك لە کەمبونەوەی ئازارەکەیان خۆشحاڵ دەبن، بۆ نمونە با گریمانی ئەوە بکەین کە من سەرم ئازاری هەیە، بە مەساج یاخود بە ئاوخواردنەوە سەرم باش دەبێتەوە و خۆشحاڵ دەبم، ئەمە لەکاتێکدایە کە تازە گەڕاومەتەوە بۆ بارودۆخی ئاسایی سەرتای خۆم! بەڵام کەسێکیش هەیە کە سەری ئێش ناکات، بەڵام خەریکە بیر لەوە دەکاتەوە کە کتێبێك بخوێنێتەوە، قاوەیەك بخواتەوە، قسە لەگەڵ ئازیزێکدا بکات، خواردن بە باڵندەیەك بدات، سەردانی خانەوادەیەك بکات و....هتد ئەمانە خۆشحاڵی دەکەن، چونکە سەرقاڵی دروستکردن و خولقاندنی بەهاکانە.

***

ئەو کەسەی کە گیرۆدەی مادەهۆشبەرەکانە، ئەوەندە ئازاری هەیە کە دەبێت مادەکە بەکار بهێنێت بۆ ئەوەی ئازارەکەی کەم ببێتەوە و تازە بە تازە ببێتەوە بە کەسێکی ئاسایی. ئەمە خۆشحاڵی دەکات.

بەلاَم ئەمە بەها نییە. بەلْکو بەها ئەوەیە کە مەسەلەکان چارەسەر بکەین و چێژ لە چارەسەرکردنی مەسەلەکان وەربگرین. لە بون و نەبونمان جیاوازی دروست ببێت. بەیانی کە دەچینە ناو کۆمەلگەوە، ئاورێك دەدەینەوە بۆ دواوە بۆ ئەوەی بزانین چ کارانێکمان ئەنجامداوە و لەوەی کە کاریگەریمان هەبوبێت چێژ وەربگرین. هەرکاتێك خودای نەکردە لەناو دلْتاندا برینێکی کۆنەتان بینیی، یەکسەر بە خۆتان بلێن: (هاوار بەمالْی من! باشە بۆچی ئەمانەم هێشتوەتەوە؟ باشە بۆچی خەریکم هێز دەدەمە بەر خۆلْ و خاشاکەکانی ناو دلْم؟ باشە بۆچی ناهێلْم باش ببمەوە؟ (بە شێوەیەکی ئاسایی، تێپەڕینی کات یارمەتی باشبونەوەکان دەدات، بەلاَم هەندێکجار ئێمە خۆمان ناهێلْین).

***

منیش بەو هاوڕێ ئازیزەم گوت، هەرکاتێك توانیت کێشە و مەسەلەکانی خۆت (بە تەنیایی یان بەیارمەتی خەلْکانیتر) چارەسەر بکەیت، پێمبلْێ بۆ ئەوەی دەستخۆشیت لێبکەم و ئافەرینت بکەم و خۆشەویستی و ڕێزم بۆ تۆ زیاتر ببێت. ئاخ هەلْکێشان و خۆ بە خەمبار و خەفەتبار نیشاندان، نرخ و بەهای تۆ لەلای من دەهێنێتە خوارەوە، چونکە وادەزانم تۆ ناتوانیت چارەسەری کێشەکانی ژیانت بکەیت و ناتەوێت چارەسەریشیان بکەیت. ئەمانە و ئەوەی کە کەسێکی ئافەرێنەر نەبیت هەمویانت کردوەتە دەستمایە بۆ ژیانت، بۆ

نەجولآنت، بۆ ئینکاریکردن بەرامبەر بە مرۆڤەکانیتر و...هتد. هیچکام لەمانە بەها نین.

***

با یارمەتی یەکتری بدەین بۆ ئەوەی بەها ڕاست و دروستەکان لە ژیانماندا جێگر بکەین. نابێت برینە کۆنەکان لە دڵ و دەروونماندا بونیان هەبێت. هەموو شەوێك، هەر برینێك کە دەبێت باش ببێتەوە، بیخەینە لاوە. هەموو شەوێك دەبێت ئەمکارە بکەین! نابێت هەفتەیەك بخایەنێت، ئیتر چ بگات بە مانگ و ساڵ. هاتوین کە گۆڕانکاری بەدی بهێنین و دروستبکەین و ببینە بەڵگەی سەلمێنەری موعجیزەی ئیلاهی، ئەمەش گونجاو نییە، مەگەر ئەوەی کە بە شێوەیەکی ئیلاهی بجولێینەوە.

# لەم سێ کەسە ببورن

لە دانیشتنێکدا، خاتونێك هەبوو کە هەمیشە بۆڵەی دەهات و باوەڕی وابوو کە خۆشبەختی و بەختەوەری بونی نییە و ژیان هەموی ڕەنج و دەرد و ئازارە. کۆمەڵێك لایەنگر و کرمەڵێکیش دژبەری ئەم قسەیە ئامادەبون. باسەکە درێژەی کێشا و منیش سەیرم دەکرد و حەزم دەکرد بزانم دیدگاکان چین و هاوڕێیان چۆن بیر دەکەنەوە. بزانم خۆشبەختی و بەختەوەری هەر هەیە؟ ئەگەر هەیە چۆن دەبێت پێی بگەین و ئەگەریش نییە دەبێت چی بکەین؟ چەند خولەکێك تێپەڕی و هەندێك لە هاوڕێیان بە ئامادەبونی منیان زانی و بیرو بۆچونیان لەوبارەیەوە پرسیم. بە سەرنجدان بەو شارەزاییە ڕێژەییەی کە لەو باسەدا، سەبارەت بە ئەو کەسانە و ئەو خاتونە بەدەستم هێنا، گوتم ئەمە بابەتێکی زۆر گەورەیە و چەندین سەعات دەتوانین لەبارەیەوە قسە وباس و گفتوگۆ بکەین و دیدگا جیاوازەکان هەڵبسەنگێنین، بەڵام من یەك بۆچونم هەیە. داوا لە ئێوەی خوێنەری بەڕێزیش دەکەم لەم باسەدا کە لەناو کۆمەڵێك خەڵکدا خراوەتەڕوو، خاتونێك دەڵێت خۆشبەختی بوونی نیە و هەندێك پشتیوانی لەقسەکەی دەکەن و هەندێکیتریش دژی قسەکەی وەستاونەتەوە و

لەمبارەیەوە قسەو باس دەکەن، بەشداری بکەن و بیر لەوە بکەنەوە کەئایا خۆشبەختی بونی هەیە یان نا؟ ئەگەر هەیە چۆنە؟ چۆن دەکرێت بەدی بهێنرێت؟ یاخود چۆن دەکرێت زیاتر بکرێت؟

ئەو شتەی کە سەلمێنراوە ئەوەیە کە سەرەتا دەبێت پێناسەی خۆشبەختی بزانین. خۆشبەختی واتە: (هەستکردن بە خۆشبەختی). واتە بریتیە لە ( هەست)ێك. شتێك نییە کە پایەدار بێت. هەروەك جۆگەلەی ئاوە، دەدەگۆردرێت و بەرزو نزم دەکات. هەروەها خۆشبەختی بریتیە لە توانایی لەناو من و ئێوەدا. شتێك نییە کە بەهۆی هەبونی شتێکیترەوە بۆمن بەدی بێت. خانوکڕین و هەبونی هاوسەر و منداڵ، ئەم هەستە لەناو مندا زیاد و کەم پێدەکات، بەڵام ناتوانێت (بەدیهێنەر)ی خۆشبەختی بێت. هەستکردن بە خۆشبەختی بریتیە لە شیاوی و لێهاتنێکی زەینی، ئەوە من و ئێوەین کە دەتوانین بەجۆرێك بیربکەینەوە و سەیربکەی و کار بکەین کە خۆشبەخت و بەختەوەر ببین.

سالها دل طلب جام جم از ما می کرد

ان چە خود داشت ز بیگانە تمنا می کرد!

واتە: سالآنێکە دڵ داوای جامی جەممان لێدەکات، ئەوەی کە خۆی هەیەتی لە بێگانەی داوا دەکات.

ئەوە بریتیە لە توانایی لەناو من و ئێوەدا. دەبێت بە فێربون و ڕاهێنان زیاتری بکەین، بەیەکەوە یەکێك لەم بەشانە لەناو ئەم یاداشتەدا دەکەینەوە. بۆ ئەوەی کە خۆشبەخت ببین، دەبێت بتوانین

لە سێ کەس ببورین. پێش ئەوکارە هەرگیز ناتوانین خۆشبەخت ببین. بەڵکو هەمیشە وەك پوشەکایەك لەسەر شەپۆلەکان بەرز و نزم دەکەین. لە دەستی خەڵکیتردا دەبین و خاوەنی خۆمان نین. دەتانەوێت بزانن ئەم سێ کەسە چ کەسانێکن؟ یەکەمیان خۆتانن، تاوەکو لە خۆت نەبوری، تاوەکو لەگەڵ خۆتدا ئاشتەوایی نەکەیت، دڵنیابن ئەو شیاوی و لێهاتنەی خۆشبەخت بون و بەبەختەوەری ژیان لەناو ئێوەدا هەرگیز بەدی نایەت. خۆ ئەگەر هەبێت، بەدڵنیاییەوە کپ دەبێتەوە. هەڵەت کرد، باشە کێشە نییە، چونکە هەمو مرۆڤەکان هەڵە دەکەن. دەی قەرەبوی بکەرەوە. کارێك هەبوە و توانیوتە بەباشی ئەنجامیبدەیت بەڵام نەتکردوە، دەی ئێستە بەباشی ئەنجامیبدە. ئەگەر زیانت لە کەسێك داوە، قەرەبوی بکەرەوە، بەڵام کۆتایی پێبهێنە. دەبێت لەگەڵ ئەم کەسەدا کە خودی خۆتی ئاشتەوایی بکەیتە و لە خۆت ببوریت. ئەگەر لە ڕابوردودا کارێکی هەڵەت کردوە، کۆتایی هاتوە و تەواو بوە. ئەگەر دەتوانیت قەرەبوی بکەیتەوە، دەی پەلە بکە و قەرەبوی بکەرەوە. ئەگەریش ناتوانیت قەرەبوی بکەیتەوە، دەی لەبیری خۆتی ببەرەوە. ئەگەریش ناتوانیت فەرامۆشی بکەیت و لەبیری خۆتی بەریتەوە و ئەو هەڵەیە دووبارە دەکەیتەوە. ئەوە دڵنیابە کە هەمیشە ژیانت خراپ دەکەیت، هەمیشە لەناو ئیش و کاری خۆتدا خراپکاری و تێکدان و ڕوخاندن دەکەیت. لەگەڵ خۆتدا ئاشت ببەرەوە و لە خۆت ببورە، (هەر بەوجۆرەی کە هەیت لە خۆت ببورە و خۆت ببەخشە). ئێمە مرۆڤانێکی (پریفکت)

نین، پریفکت واتە بێ هەڵە و پەڵە و کەموکوڕی. هەمومان کەموکوڕیمان هەیە. هەرگیز وابیر نەکەینەوە کە دەبێت کامڵ و تێر و تەواو بین و هیچ کەموکورتیەکمان نەبێت و لە هەڵە بەدور بین.

***

دوەمینی کەسەکان کە دەبێت بیانبەخشین و لێیان ببورین، باوك و دایکمانن. بەمکارە، یەکسەر خۆشبەخت دەبیت. بۆچی؟ چونکە خۆشبەختی دیاری و خەلاتی پێگەیشتن و باڵغبونە. واتە پێگەیشتن و باڵغبونی دەرونی. پێگەیشتن و باڵغبونی دەرونی ڕوونادات مەگەر ئێوە بگۆڕدرێن و ببنە بونەوەرێکی سەربەخۆ. ئەو کەسەی کە هەمیشە بیر لەوە دەکاتەوە کە دایکوباوکی چیان بەو کردووە، چەندێك زیانی بەرکەوتوە، چەندە خراپ پەروەردە کراوە و...هتد. چۆن ئەیەوێت هەستی خۆشبەختی هەبێت؟ ئەو کەسەی کە بە منی دەگوت ئەم باوکەی ئێمە تەنها هێندە بەس بوو کە لێرەدا خانویەکمان بۆ بکرێت. دەزانیت ئێمە چی بوین؟ چەندێك پارەمان هەبوو؟ چاوەڕێ بوو کە پێی بڵێم چ باوکێکی خراپت هەبووە. گوتم تۆ پێتوایە ئەگەر باوکت ئەمەی بکردایە، ژیانی ئێوە دەگۆڕدرا، وەلامیدایەوە بەڵێ، ژیانمان زۆر دەگۆڕدرا و بەرەو باشی دەچوو. منیش گوتم باشە تۆ ئێستە خۆی باوکیت. دەی ئەمکارە بۆ منداڵەکانت بکە. خۆ تۆ شارەزایت و دەزانیت، دەی تۆ ئەوکارە بکە کە باوکت نەیکردوە! بیانوی هێنایەوە و گوتی ئەوکاتە زەوی هەرزان بوو، منیش گوتم ئێستە ئەگەر تۆیش بچیت و لە شوێنێکی هەرزاندا

زەوی بکرێت، ٢٠ بۆ ٣٠ ساڵیتر ئەو شوێنە قەرەباڵغ دەبێت و دونیا پێش دەکەوێت و منداڵەکەت بەباشی دەژی. بەڵام کێشەکە لێرەدا نییە. کێشە و ڕەخنەکە لەوەدایە بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێین کە کەموکوڕییەکان بخەینە ئەستۆی ئەو. تاوەکو ئەو کاتەی کە مرۆڤ پەنجەی تۆمەت بەرەو کەستانیتر ڕادەکێشێت و مەسەلەو کێشەکان بەرەو خەڵکانیتر دەوەشێنێت، هەرگیز خۆشبەخت نابێت. چونکە خۆشبەختی دیاری باڵغبون و پێگەیشتنە. مرۆڤی باڵغ و پێگەیشتو لە ڕوی جەستەیی و دەرونیەوەیە کە خۆشبەخت دەبێت. منداڵەکان خۆشحاڵن نەوەك خۆشبەخت. چونکە ئەگەر بێت و کەمێك لێیان دور بکەوینەوە، یەکسەر دەستدەکەن بەگریان و دەلەرزن. چونکە سەرچاوەی خۆشیان لەناو خۆیاندا نییە و لەناو کەسێکیتردایە. دەبێت ئەوە فێری منداڵەکانمان بکەین کە بە خۆشبەختی پەروەردە بن و فێر بن کە باوەڕیان بەخۆیان هەبێت. بەڵام ئەگەر من لە تەمەنی ٥٠ ساڵی یان ٥٥ ساڵیدا وەك منداڵێکی ڕیشدار چاوەڕێ بم کە خەڵکانیتر بێن و خۆشبەختم بکەن و کێشە و مەسەلەکانم چارەسەر بکەن، هێشتا منداڵم و منداڵیش ناتوانێت خۆشبەخت ببێت، مەگەر کەسێکیتر بێت و خۆشبەختی بکات. دەبێت ئەوەش بزانین کە خەڵکیش سەرقاڵی ئیش و کارو ژیانی خۆیانن. هیچ گرنتیەکیان نییە کە کار بۆ ئێمە بکەن. باشە بۆچی دەبێت فلانەکەس خزمەتگوزاری پێشکەشی من بکات؟ باشە ئەی بۆچی من خزمەتگوزاری پێشکەشی خەڵکی نەکەم؟ کەوابوو گروپی دووەم کە دەبێت خۆشمان بوێن

بریتین لە دایکوباوکمان. ئەگەر لەوان خۆشبویت و ئەوەت گوت کە ئەوان بەپێی توانای خۆیان هەرکارێك لە دەستیان هاتبێت بۆ منیان ئەنجامداوە، دواتر دەتوانیت ئەوکارەی کە دەتویست لەکاتی منداڵی و لاویدا بۆتی ئەنجامبدەن، خۆت بۆ خۆتی بکەیت و ببیتە کەسێکی خۆشبەخت و بەختەوەر.

***

بەڵام بابزانین گروپی سێیەم کامانەن کە دەبێت بیانبەخشین و لێیان ببورین، بریتین لە مرۆڤەکانیتر (خەڵکانی دەوروبەرت). ئەو کەسەی کە بەردەوام بۆڵەی دێت و گلەیی دەکات، ئەوە ڕۆحی پڕە لە ژەهر. ئەو کەسەیش کە ژەهراوییە هیچ ووزەیەکی نیە، ناتوانێت بچێت بە ڕێگادا و ناشتوانێت پێبکەنێت. ئەگەر توانیت خەڵکانیتر ببەخشیت، دڵنیابە خۆشبەخت دەبیت. سەیری پیاوە مەزن و گەورەکانی مێژوو بکەن. بە یەك چاو سەیری هەموو خەڵکیان کردووە، بە یەك ڕێزو گەورەییەوە سەیری مرۆڤەکانی دەوروبەری خۆیان کردووە و گوتیانە ئەمە جۆری مرۆڤە و هیچ جیاوازییەکیان لەنێوان خەڵکیدا نەکردوە. لە پەیام و ڕێنماییەکانیاندا گوتویانە ئەمە یان خوشکی تۆیە یان برای تۆیە یاخود هاوشێوە یاخود هاوشانی تۆیە. بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکە.

به جهان خرم از انم که جهان خرم از اوست
عاشقم بر هەمه عالم که هەمه عالم از اوست

واتە: سوێند بە جیهانی سەر سەوزو ئاوەدان، منیش لەوم کە جیهان لەو دروستبوە. هەموو جیهانم خۆش دەوێت، چونکە هەمو جیهان دروستکراوی ئەوە.

کاتێك دەڵێیت خودا، ئەم زەمین و ئەو ئاسمان و خاکەش هەر خودایە. چونکە خوداوەند بە شێوە جیاوازەکان لە هەموو بونەوەردا بوونی هەیە. هەربۆیە دەبێت ڕێز لە شێوە جیاوازەکانی خوداوەند بگریت. یەکێك خوداکەی کەمترە و ئەویتر خوداکەی زیاترە، هەردوکیان قبوڵ بکەن. ئەوکات دەبینیت کە ژیانت باشتر دەبێت. چونکە ئیختیاری ژیانت بە کەسیتر نەداوە. ئەم شیاویە لەناو ئێوەدایە. ئەوکات خەڵکی ناتوانن ئێوە بڕەنجێنن.

***

جفا برین و ملامت کشیم و خوش باشیم

که در طریقت ما کافریست رنجیدن

واتە: جەفا بکێشین و لۆمە بکرێین و دڵخۆش بین، لە تەریقەتی ئێمەدا ڕەنجان وەك کافری وایە.

***

حافیز ئیختیار و ئازادی بۆ کەسێك ڕجوا نابینێت کە بیڕەنجێنێت. حافیز کافرە ئەگەر بێت و ئەمکارە بکات. ئیختیار و ئازادی هەڵبژاردنی هەستی من لە دەستی خۆمدایە. هەربۆیە ڕێگە نادەم خەڵکی بمڕەنجێنن. ئەگەر کارێکی خراپیشیان کرد، ئەوا مافەکانی خۆم بەدی دەهێنم، بەلاَم ناهێڵم زیانی دەرونیم پێبگات. ئەگەر زەرەر

و زیانی داراییشم کردبێت، ئەی باشە بۆچی دەبێت زەرەرو زیانی ڕۆحی- دەورنی بکەم؟

***

ئەو هاوڕێیانەی کە لەناو ئەو کۆڕەدا بون، چون بەناو بیرو خەیاڵدا. پرسیارم لێکردن و گوتم: ئایا ئێوە لەدەستی هیچ کەسێك نەڕەنجاون؟ ئایا پەیوەندیتان لەگەڵ خۆتاندا باشە؟ ئایا توانیوتانە لە خۆتان ببورن؟ ئەگەر نەتتوانیوە لە خۆت یان باوك و دایکت یاخود مرۆڤەکانی تر ببوریت و دەرکیان بکەیت و بەو جۆرەی کە هەن قبوڵیان بکەیت، ئەوا دڵنیابە هەمیشە لەبەردەم مەترسیدایت. هەمیشە بەرەو ئاراستەی تۆ تیر دەهاوێژن. تیرگەلێکی پیس و ژەهراوی. چونکە تۆ ئەم ئیختیار و ئازادییەت پێداون. بە خۆتاندا بچنەوە و ڕێگە نەدەن ڕەنجانەکان زاڵ ببن بەسەرتاندا، یاخود ئێوە هەڵبسوڕێنن. ڕێگە مەدەن بزوێنەری ژیانی ئێوە توڕەیی و تۆڵە بێت. چونکە تۆڵە بێهودەترین کاری جیهانە. تۆ لەبری ئەوەی کەسێك لەناو بەریت، هەوڵبدە کەسێك ڕزگار بکە. بون و وجودی خۆت بە دروستکردن و بونیاتنان نیشانی خەڵکی بدە. نەوەك بە خراپکردن و ڕوخاندن. بون و وجودت بە عاشقبون بسەلمێنە. نەوەك بە نەفرەت کردن لەخەڵکی. هەبونت بە شێوەیەکی ئەرێنی بۆ خەڵکی بسەلمێنە. لەبری نەفرەت دوعاو نزا و پاڕانەوە بکە. لەبری ئەوەی کە لەلای خودا نەفرەت لەکەسێك بکەیت، داوای شتێکی لێبکە و بڵێ: خودایا کارێکم پێبکە کە بتوانم زیاتر دەرك بکەم. بەمجۆرە ئەرێنیە بیر بکەنەوە.

ئەوکات دەبنە خاوەنی هەموشتێك و هەم خۆشحاڵیش دەبن. خۆشبەخت و بەختەوەریش دەبن. با ڕێگە نەدەین بیرو فیکرە نەرێنیەکان، هەروەك لافاو خۆشی و بەختەوەری ئێمە بشۆنەوە و لەگەڵ خۆیدا ڕاییماڵێت. ڕاهێنان بکەن: هەر ئەمڕۆ! هەر ئەمشەو! دەفتەرچەیەك هەڵبگرن و ئەو ڕەنجانانەی تێدا بنوسن کە لەبەرامبەر خۆتان دایکوباوکتان و خەڵکانی دەورووبەرتاندا هەتانە. بیاننوسن و ڕێگەچارەیان بۆ بدۆزنەوە. ڕێگە بدەن لە ئێستە بەدواوە، بزوێنەری ئێوە عەشق و دۆستایەتی بێت، نەوەك ڕەنجان و نەفرەت کردن.

# وانەی گرنگی ژیان لە پیرەپیاوێکی گوێز فرۆشەوە

لەبیرمە نزیکەی ٢٥ ساڵ لەمەوبەر، نیوەڕوان کە کۆمپانیاکەمان دەیکردە پشوو، لەگەڵ باکمدا دەچومەوە بۆ ماڵی ئەوان و پشویەکم دەدا و دواتر دەگەڕامەوە بۆ سەر ئیشەکەم. لەم ڕێگاو مەسیرەی چون و هاتنەوەمدا، ڕووداوانێکی سەرنجڕاکێشم دەبینی. ڕۆژێکیان (لەبەر ئەوەی وەك هەر کۆمپانیایەکیتر کۆمپانیاکەی ئێمەش بەهۆی گەشەکردنیەوە توشی کۆمەڵێك قەیران بوبو، من هەستێکی باشم نەبوو، نائومێد و نیگەران و بێتاقەت بووم، بەتایبەت کە مەسەلە لاوەکیەکانیش هاتبونە ناو ئەم بابەتەوە) بیرم کردەوە ئەمە چ ژیانێکە کە هەر لەبەیانیەوە هەڵدەستینەوە و ڕادەکەین. کۆتاییەکەیشی چی، چوبومە ناو ئەو فەرمانگە نەگریسەوە کە مرۆڤ بەو دڵسۆزیە بێ جێگانەی کە بۆ خۆی دەیانکات، لەبری دۆزینەوەی ڕێگەچارە، تەنها حاڵی خۆی خراپ دەکات.) هەروا کە باوکم سەرقاڵی شۆفێریکردن بوو من لەتەنیشتیەوە دانیشتبوم، لەسەر چوارڕییانەکەی نزیکی تهران پارس پیرە پیاوێکم بینی کە لەسەر عەرەبانەیەکی کۆنی منداڵانە سینیەکی دانابوو هەندێك گوێزی تێدا

بوو لەگەڵ ترازویەکی بچوك و چەند پارچە بەردێکدا. پاشنیوەڕۆیەکی گەرم بوو. دەبینم لەژێر سێبەرێکدا دانیشتوە و خەریکی پشودانە. بۆ ساتێك مێشکم کلیکی لەسەر کراو لە خۆمم پرسی باشە ئەم پیاوە تەمەنی چەندە؟ بە بەراورد بە تەمەنی ئەوکاتەی من، نزیکەی ١٠ بۆ ٢٠ساڵێك لەمن بەتەمەنتر بوو. باشە سەرمایەی ئەمە چیە؟ عەرەبانەیەك کە بە سینی و گوێز و ترازوەکەی ناوییەوە، دوو هەزار تمەن زیاتر نەدەژیا. باشە ئەقڵ و هۆش و بیری دەبێت چی بێت؟ بە کەسێکی هۆشیار و خاوەن بڕوانامە و بازرگان نەدەهاتە پێشچاو. شتێکی دانابوو کە ژیانی خۆی پێ بگوزەرێنێت. لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە و گوتم مەحمود گیان! ئەم پیاوە لەم تەمەنەدا، بەدڵنیاییەوە خانویەکی زۆر ڕێکوپێکیشی نیە، ژیانێکی خۆشگوزەرانیشی نییە، لەوانەیە موچەی خانەنشینیشی نەبێت. پاشەکەوتی زۆریشی نەبێت. ئەم پیاوە بەیەك عەرەبانە و بە سینیەك گوێز و ترازویەکەوە، بەڕێکەوتوە و خەریکە دەژی، لەسەر پێی خۆی وەستاوە. دەرۆزەیی ناکات. زەلیل و زەبون نییە. لە سوچێکیشدا پشو دەدات و دواتر بەڕێدەکەوێت و دەستدەکاتەوە بە گوێز فرۆشتن و بەیانیش بەهەمانشێوە. باشە تواناییەکانی من زیاترن یاخود ئەم پیاوە؟ دەبینم من! بڕوانامە و خوێندنی زیاتر، پارەی زیاتر، ئیعتیباری زیاتر، موشتەری و کڕیاری باش، هاوڕێ و هاوکارانی دیار و دوکانداری باشم هەبوو. ئێستە کە دەچمەوە خواردنەکەم ئامادەیە. بە سەیارە

دێم و دەچم. ئەم هەموو مرۆڤە دارایە خزمەتگوزاری تایبەت پێشکەشی من دەکەن. باشە من چیم لێ بەسەرهاتوە؟

داوام لە باوکم کرد بوەستێت. کچە بچوکەکەم لە کوشنی دواوەی سەیارەکەدا دانیشتبو. لەسەیارەکە دابەزیم. دەستم خستە سەر ئەژنۆم و ڕێزێکم بۆ پیرەپیاوە گوێژ فرۆشەکە نواندا، لەبەر ئەوەی کە لە پشودانەدا بوو بێزارم نەکرد. سواری سەیارەکە بومەوە و بەرێکەوتین. باوکم و کچەکەم سەریان سوڕما. هۆکاری ئەوکارەیان لێپرسیم. منیش گوتم: ڕێزم لە گەورەیی مرۆڤ، لە ڕۆحی، لە هیواو ئومێدەکانی و لە هەوڵ و کۆششەکانی گرت. ڕێزم لەو مامۆستای ژیانەی خۆم گرت، مامۆستایەك کە لەو هەلومەرجە سەختانەدا بەردەوامە لە ژیانی خۆی، منی فێر کرد کە لەسەر پێی خۆم بوەستم، بەهاکانم ببینم، سوپاسی خودا بکەم، بۆڵە نەکەم. بە ئەرێنی بیر بکەمەوە و لەناو خۆمدا بێمە دەرەوە. مرۆڤ کاتێك زۆر بیر لە خۆی دەکاتەوە، بێ هیواو خەمۆك دەبێت. یەکێك لە هۆکارەکانی خەمۆکی بریتیە لە بیرکردنەوەی زۆر لە خۆمان. کاتێك زیاد لە ئاست بیر لە خۆم دەکەمەوە بیرم دەچێتەوە کە خەڵکانێکیتریش هەن، دوونیایەکیتریش هەیە، درەختگەلێکیش بوونیان هەیە، کۆمەڵێك باڵندەش هەن. بیرم دەچێتەوە پێشەنگ و پێشەوا بۆ خۆم بگرم.

***

ئەو ڕۆژە لەناو ئەو ئۆتۆمبیلەدا مامۆستای خۆمم دۆزییەوە، کە لەسوچێکی ئەو کۆڵانەدا ڕاکشابوو. ئەو وانەیەی بە من گوتەوە کە

ئازاو بوێر بە، چونکە توانایی نرخ و بەها لە هەلومەرجە سەختەکاندا دەردەکەوێت. ئەگەر بارودۆخ و حاڵ و ئەحواڵ باش بێت، ئیتر کاروبارەکان خۆیان بەرەو پێشەوە دەچن! ئیتر من هیچ کارێکی گرنگ ناکەم! ئەگەر ئەو هەموو چیرۆك و داستانەمان خوێندوەتەوە، باشە بۆچی بووە؟ بۆ ئەوە بووە کە لەکات و ساتە سەختەکاندا کە دونیا بەپێی حەزو ئارەزوی ئێمە ناسوڕێت، چی بکەین. لەوێدایە کە دەبێت تامڵمان هەبێت. هەر ئەو ساتەیە کە دەبێت لەبیرتان بێت کە باوپیران و پێشەوایاننتان چیان کردووە، ئێوەش هەمان شت بکەن. لەئێستە بەدواوە لەبری بۆڵە بۆڵ کردن و ڕەخنەگرتن و دڵسۆزیکردن بۆ خۆمان، لەبری ئەوەی کە زۆر لە کۆت و بەندی خۆماندا بین، با لەناو خۆماندا بێینە دەرەوە. لەناو خۆمان بێینە دەرەوە و سەیری دوونیا بکەین. چونکە کەسانێکی بێجگە لە ئێمەش بونیان هەیە، ئەو کەسانەی کە لەدەوروبەری ئێمەدان. پێویست ناکات سەیری (بیل گیتس) بکەین، (بیل گیتس)ی من لە گۆشەیەکی ئەو شەقامەدا ڕاکشابوو. مامۆستا و فێرکار و پەروەردەکاری من لەوێدا خەوتبوو. پێشەنگ هەیە، بەڵام دەبێت قوتابی بوونی هەبێت، بۆ ئەوەی مامۆستاش هەبێت.

***

خاتون و کاکەی بەڕێز، ئایا ئێوە کە لە ژیان بێزارن و بۆڵە بۆڵ دەکەن کە بۆچی سەیارەی فلانەکەسم نیە و وەك فلانەکەس نیم، ئایا پیاوی گوێز فرۆشتان بینیوە؟ گوێز فرۆشی ژیاننتان بینیوە یان نا؟

ئەگەر بیبینن، سوپاسی خودا دەکەن. من بەهیچ شێوەیەك مەبەستم ئەوە نییە کە بە بچوکی بمێنینەوە و گەشە نەکەین. ئێمە ناتوانین بچوك بین. من مەبەستم ئەوەیە بڵێن کاتێك نرخ و شیاوی شتێکتان هەیە، خۆتان بەو شێوەیە بزانن کە هەن. کاتێك نائومێد دەبن کە نەزانن ئێوە کێن. تەنها مەسەلەکە دەبینن. براکەم کاك (مەسعودی موعەزەمی) یارییەك لە دەرەوەی وڵات لەگەڵ قوتابیەکانیدا دەکات. پێیاندەڵێت دەستتان بهێنە پێشەوە و سەیری بکەن. دواتر دەپرسێت دوونیا گەورەترە یان لەپی دەستی ئێوە. هەمویان دەڵێن دوونیا. دواتر دەڵێت دەی ئێستە دەستتان بهێننە پێشترەوەو لەبەرچاوتاندا رایبگرن. ئێستە پێم بڵێن دوونیا گەورەترە یان لەپی دەستی ئێوە. هێشتا هەر دونیا گەورەترە، بەڵام ناتوانن دوونیا ببینن. بۆچی دونیا نابینن؟ لەبەر ئەوەیە کە لەپی دەستتان دەبێتە بەربەست لەبەردەم بینینتاندا. ئەمە مانای ئەوەنیە کە دوونیا نەبێت. ئەی باشە بۆچی بە شێوەیەکی زۆر و لەڕادەبەدەر لەپی دەستمان دەهێنینە بەرچاوی خۆمان؟ ئەم لەپی دەستە نیشانەی موسیبەت و کێشەیە. ئەگەر زۆر نزیکی کێشەکان ببنەوە، ئیتر دونیا و ڕێگەچارەکان نابینن و ئەوکات بێهیوا دەبن.

***

من ئامۆژگاریتان ناکەم کە کێشەکانتاندا لەبەرچاو نەگرن و پشتگوێیان بخەن، بەڵام مەشیان لکێنن بە چاوەکانتانەوە. بەڵکو بە هەمان قەبارە و ئەندازە کە هەن بیانبینن. کێشەکان بە هەمان

ئەندازە کە هەن ببینن. بەڵام با بزانین کێشە گەورە و بچوکەکان چین؟ ئەگەر چاو یاخود دەستی بوکەشوشەیەك دەربهێنرێت، یاخود تایەی سەیارەیەکی منداڵانە لێببێتەوە. دەستدەکات بە گریان. ئەوە بۆ ئەو موسیبەتێکە. بۆ ئەو کێشەیەکی زۆر گەورەیە، بەڵام بۆ ئێوە کێشەیەکی گەورە نیە. چونکە ئێوە دەزانن تایەی سەیارەکەی بخەنەوە جێگەی خۆی و دەستی بوکە شوشەکەی بۆ چاکبکەنەوە، یاخود دانەیەکیتری نوێی بۆ دەکڕن. بەمشێوەیە منداڵەکە هێمن دەبێتەوە. باشە بۆچی ئەم مەسەلەیە بۆ ئێوە ئاسانە؟ چونکە ئێوە سەبارەت بەم مەسەلەیە تواناو لێهاتننتان هەیە، بەڵام منداڵەکەتان سەبارەت بە هەمان مەسەلە بێتوانایە، هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەم مەسەلەیە بەلای ئەوەوە کێشەیەکی زۆر گەورەیە. لەڕاستیدا ئەوە مەسەلە و کێشەکان نین کە بچوك و گەورەن، بەڵکو ئەوە توانا و لێهاتنەکانی ئێمەن کە زیاد و کەمیان هەیە. ئەوکاتەی کە تواناییەکان زۆرن، کێشە و مەسەلەکان بچوکن. کاتێکیش توانایی و لێهاتنەکان کەمن، مەسەلە و کێشە بچوکەکانیش گەورە دەبن.

***

دەی کەوابوو، یەکەم: بەپێی پێویست دەستت لە خۆت دور ڕابگرە. مەسەلەکە زۆر گەورە مەکە. ئەگەر لەگەڵ هاوسەر یان منداڵ یاخود هاوکار و بەڕێوەبەرەکەتدا جیاوازیت هەیە، باشە ئەوە چ کێشەیەکی تێدایە؟ بۆچی هێندە گەورەی دەکەیت؟ تەنها لەبەر ئەوەیە کە بەوجۆرە ڕاهاتوین. دووەم: توانا و لێهاتنەکانی خۆمان

نابینین. ئەگەر منداڵ فێری ئەم لێهاتن و شارەزاییە ببێت، ئەوا هەر خۆی دەستی بوکەشوشە یاخود تایەی سەیارەکەی دەخاتەوە جێگەی خۆی و چاکی دەکاتەوە. لەبیرتان بێت زۆربەی کاتەکان ئێمە وەك ئەو منداڵە شین و گریان وەڕێدەخەین و قاچ دەکوتین بە زەویدا، بۆ شتێك کە نرخ و بەهایەکی ئەوتۆی نییە و گونجاوە بۆ چارەسەر کردن. کەمێك سەبر و حەوسەڵەتان هەبێت. کێشەکان نە گەورەن و نە بچوکیش. ئەوە مرۆڤەکانن کە بچوك و گەورەن، مرۆڤی گەورە کێشەکان بەلایەوە بچوکن، بەڵام بۆ مرۆڤە بچوکەکان کێشە و مەسەلەکان زۆر گەورەن. هەوڵبدەن لە مرۆڤە گەورەکان بن، چونکە بەگەورەییەوە ئافرێنراون. کاتێك لەگەڵ سەرچاوەی بەدیهاتن و لە گەورەیمانەوە مەودا وەردەگرین، ژیانمان تاڵ دەبێت.

***

با بەخۆماندا بێینەوە. چاوێك بە بەهاکانماندا بخشێنینەوە. ئەو کارە بەنرخانەی کە بەدرێژایی ڕۆژ یان هەفتەدا ئەنجامامان داوەن، یاداشتیان بکەین. ڕپرس و ڕاوێژ بکەین. هیچ پێویست ناکات کە هەموو مەسەلەکان هەر خۆمان چارەسەریان بکەین. با فێر ببین. بەشداری لە سیمینار و خولە فێرکارییەکاندا بکەین. سیمینارگەلێك لەبارەی سەرکەوتن، ئامانج، هاوسەرداری، خاوەنبونی کۆمپانیا، پەروەردەی منداڵ و ....هتد بونیان هەیە و پێویست ناکات بۆ فێربونی ئەو شتانە بچینە زانکۆ، بڕۆنە ئەو خول و سیمینارانە و فێر بن و جێبەجێ بکەن. ئێستە ئێوە دەزانن کاتێك مەسەلەیەکتان بۆ

ماته پێشەوە، میشکی میهرەبانتان پێتاندەڵێت کە زۆر گەورەی مەکە. یەکەم ئەمە تەنها کێشە و مەسەلەیەکە. دووەمیش ئایا من چ تواناگەلێکم هەیە؟ ئەگەر دەتوانیت چارەسەری بکە و ئەگەریش ناتوانیت ڕاوێژ لەگەڵ کەسانی شارەزادا بکە، هەمیشە ئەمکارە بکە بۆ ئەوەی سەرکەوتو بیت و بەشادی و سەربەرزییەوە بژیت.

# چ کاتێک ئاسمان تەختی زەوی دەبێت؟

زستانی چەند ساڵ لەمەوبەر لە ئێراندا، زستانێکی زۆر سەخت بوو. هەروەك دەگوترا لەماوەی ٤٠ ساڵی ڕابوردودا زستانی وەها نەبووە. منیش لە کلاردەشتدا ڤێلایەکم هەیە و هەرکاتێك بوار و کاتم هەبێت، بۆ ڕاکردن لە ئالودەیی و پیسی هەوا و پشوی ئەعسابم دەچم بۆ ئەوێ. کاتێك دەچوین بۆ ئەوێ و چوینە ژورەوە، هەروەك جاران بەلوعەکانمان کردەوە و شۆڤاشەکانمان داگیرساند. دەبینین هەموو بۆرییەکان بەستویەتی، کاتێك ماڵەکە گەرم بوو، درزو کون و کەلەبەرەکان دەرکەوتن. شۆڤاش و بۆری ئاوەکان درزیان بردبوو کون بوبون یاخود دەلاندنیان هەبوو. شانسمان هەبوو کە بەلوعە و قوفڵی سەرەکی ئاوەکە بەستبوی، وەگەرنا هەموو خانوەکە وێران دەبوو. ناچاربوین کە تکا لەیەکێك لە هاوڕێیانی ئەو ناوچەیە بکەین کە وەستایەکی بۆری یان وەستایەکی شارەزای شۆڤاشمان پێ بناسێنن. بەڕێزێکیان پێ ناساندین کە لەکاری خۆیدا زۆر بەڕێز و خاوەن تێڕوانین بوون. کاتێك هات، هەموو کارەکانی بەوپەڕی لەسەرخۆیی و وردەکارییەوە ئەنجامدا، تاوەکو دواتر نۆژەنکردنەوەی بنەڕەتیان بۆ بکرێت. کاتێك داوام لەو وەستایە کرد کە با بەیەکەوە دابنیشین و

چاییەك بخۆینەوە. دەرگای قسەوباس و گفتوگۆ کرایەوە. پاش ماوەیەك پیاوەکە گوتی جەنابی موعەزەمی من سەردەمێك لەشاری کەرەجدا ئیشم دەکرد. خانویەك هەبوو کە من ئاوی شۆڤاشەکەیم بە قۆنتەرات گرتبوو، وەستایەکیتریش ئاوی سارد و گەرمی ئەو خانوەی بەقۆنتەرات گرتبوو. گوتی هەروا بەپێی ڕێکەوت، لەماوی کارکردنەکەماندا یەکتریمان دەبینی و چاومان بە ئیشی یەکتری دەکەوت، من زانیم کە ئەو ئاراستەی بۆرییە ساردو گەرمەکانی بە پێچەوانەوە بەستوە، ئەمە لەکاتێکدایە کە لەحاڵەتی ستانداردا بەلوعەکانی لای چەپ، تایبەتن بە ئاوی گەرم و بەلوعەکانی لای ڕاستیش تایبەتن بە ئاوی سارد. ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەگەر کەسێك بیەوێت ئاوی گەرم بەکار بهێنێت، بزانێت دەبێت کامە بەلوعە بکاتەوە. کاتێك بەو وەستایەم گوت کە بەلوعەکان بە هەڵە دەبەستیت، لەبری سوپاسکردنم، ڕوی خۆی تاڵ کرد و نێوچاوانی دابەیەکدا و گوتی: کاکە گیان مەگەر ئاسمان تەختی زەوی دەبێت ئەگەر بەلوعەی چەپ ئاوی سارد و بەلوعەی ڕاستیش ئاوی گەرم بێت؟ وەستاکەمان کە قسەکەی دەگێڕایەوە گوتی: (من سەیرێکی وەستاکەم کرد و هیچم نەگوت و لەوساتە بەدواوە پەیمانم بەخۆمدا تاوەکو خەڵکی داوای شتێکم لێ نەکەن، من هیچ شتێك بە کەس نەڵێم).

***

ئێستە من حەقم بەسەر ئەوەوە نییە کە ئەم قسەیە ڕاستە یان نا. بەڵام پاشماوەی داستانەکە بەمشێوەیە: ئەم وەستایەی ئێمە گێڕایەوە و گوتی: کاتێك ساتەوەختی ڕادەستکردنی کارەکە هاتە پێشەوە، ئەندازیارەکان هاتن بۆ ئەوەی کارەکە وەربگرن. ڕێککەوت وابوو کە هاوین بوو. کاتێك موبەڕیدەکانیان ئیش پێکرد، دەبینن ئاوی گەرم دێتە ناویانەوە. چونکە ئەو کەسەی کە لولەکەشی موبەڕیدەکانی کردبوو، بەپێی ستانداردی ئاسایی، سوندەی ئاوی موبەریدەکانی بەستبوو. لەناو توالیتەکانیشدا بەلوعەکان ئاوی گەرمیان پێدا دەهات. بەمشێوەیە هەموو سیستەمەکە تێکەڵ بوو بەسەر یەکدا. بەمجۆرە وەستاکە تێگەیشت کە بەڵێ ئەگەر کارەکان بەپێچەوانەی ستانداردەوە ئەنجامبدرێن، ئاسمان تەختی زەوی دەبێت و بۆ ئەم بەڕێزە ڕێك بەوجۆرە دەرچوو. هەربۆیە لە وەرگرتنی پارە و لە گۆڕینی سیستەمەکەدا دەردەسەرییەکی زۆر بۆ خۆیی و خاوەنکارەکەی دروستبوو.

***

ئێستە با واز لەوە بهێنین کە ستاندارد بۆ ئاسانکاری، بۆ زمانی هاوبەش دێتە ئاراوە. وایدابنێن کاتێك من بە ئێوە دەڵێم: بەڵێ، لە فارسیدا بەگشتی مانای ئەوەیە من هاوڕام و ئەگەریش بڵێم: نەخێر واتە من هاوڕات نیم، ئیتر پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە و کات و شتەکانیتر هەیە. بەڵام ئەگەر لە شوێنێکیتردا بڵێم بەڵێ و مەبەستم نەخێر بێت و بە پێچەوانەیشەوە، ئەوکات خەڵکانی دەوروبەرم

دەکەونە هەڵەوە و لێم تێناگەن. ئەمەش ستانداردێکە کە لە کاروبارەکاندا دەخرێتەڕوو بۆ ئاسانکارییە لە ئیش و کارەکاندا. بەڵام ئەو خاڵەی کە لە گێڕانەوەی ئەم داستان و بەسەرهاتەدا ئەمەوێت جەختی لەسەر بکەمەوە و دووبارەی بکەمەوە، ئەوەیە کە: من بیرم لەوە کردەوە باشە بۆچی ئەو پیاوە سوپاسی ئەم وەستایەی ئێمەی نەکرد؟ باشە بۆچی سوپاسی کاك فەراهانی وەستای نەکرد کە خەریکبوو ڕێنمایی باشی دەکرد؟ باشە بۆچی ئێمە بەزۆری و لە زۆربەی کاتەکاندا سوپاس ناکەین؟ باشە بۆچی سوپاسکردن ئەوەندە قورسە؟ چ تکاکردن و چ داخوازیکردن بۆ ئێمە سەخت و دژوارە؟

***

خاتونێکی گەنج تەلەفۆنی بۆ من کردبوو. عاشقی هاوسەرەکەی بوو هاوسەرەکەشیان عاشقی ئەم بوو. هەلومەرجی ژیانیان باش و پەسەند بوو. ئەم خاتونە دەیگوت کە بەردەوام شەڕو ئاژاوەمانە و ناتوانین بەیەکەوە ڕێکبکەوین و بگونجێین. پرسیم بۆچی؟ گوتی لەبەر ئەوەیە کە من وا هەستدەکەم ئەگەر خۆشەویستی خۆمی بۆ دەربېڕم، لە خۆی بایی دەبێت و ئەمەش کارێکی باش نییە. منیش گوتم ئێ باشە، خۆ دەربڕینی خۆشەویستی ڕێگەی خۆی هەیە. پرسیارم لێکرد: (کاتێك کارێکت بۆ دەکات، سوپاسی دەکەیت؟) گوتی ئەگەر سوپاسی بکەم وادەزانێت خۆشم دەوێت! گوتم: ئەی باشە مەگەر خۆشت ناوێت؟ لەوەڵامدا گوتی بەڵێ! منیش گوتم: ئەی باشە بۆچی لە گوتنی دەترسیت؟

***

باشە بۆچی وادەزانین ئەگەر سوپاسی ئەو بکەین، بارێکی قورس دەکەوێتە سەرشانمان؟ باشە بۆچی وادەزانین باڵەفڕ دەبێت و لەخۆی بایی دەبێت؟ باشە ئەم بیرو باوەڕە هەڵانە لە کوێوە هاتون؟ بۆچی نایەین و ستانداردەکانی پەیوەندیەکانمان ڕاستبکەینەوە؟ باشە بۆچی کاتێك شتێکمان بەلاوە جوان و خۆشە دەڵێین (نەخێر، زۆریش بەلامەوە خۆش نەبوو!) باشە بۆچی لەبری بەڵێ دەڵێین نەخێر و لەبری نەخێریش دەڵێین بەڵێ؟ بۆچی خۆمان و خەڵکیش دەخەینە هەڵەوە؟ مەبەستی ئێمە لەمکارە چیە؟

***

هۆکارگەلێکی جیاواز بونیان هەیە. لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوەبێت کە من بەجۆرێك پەروەردە کراوم، کە وادەزانم دەبێت شارەزاییم هەبێت و هەموو شتێك بزانم. پێتوایە کاتێك من باشم و کەسێکی پەسەندم کە هەموو کارەکان بزانم و شارەزایان بم و بێ کەموکوڕیش بم. کاتێك بیری من دەخەنەوە کە خەریکە بەلوعەی ئاوە سارد و گەرمەکە بە پێچەوانەوە دەبەستم. پێمناخۆشە کە بۆچی تۆ بە هەڵەکەی منت زانیوە! بۆچی ئەوە دەدەیتەوە لە ڕوی من؟ لەبری ئەوەی کە کارەکەم ڕاستبکەمەوە، دەڵێم باشە ئەگەر بەوجۆرە بیانبەستم ئاسمان تەختی زەوی دەبێت؟ بەرامبەرەکەم پەشیمان دەکەمەوە و وایلێدەکەم لە شتەکانیتردا هاوکاری و یارمەتیم نەدات. بۆچی ڕەخنە و بیستنی ڕەخنە لەناو بون و وجودی ئێمەدا هاومانایە

لەگەڵ دوژمنایەتیدا؟ بۆچی کاتێك یەکێك ڕخنە لەمن دەگرێت، وادەزانم منی خۆشناوێت؟ بۆچی ئەمەوێت ڕەگ و ڕیشەی لە بنەوە هەڵبکەنم؟ بۆچی ئەگەر لەگەڵ شتێکدا هاوڕا نین بە ڕاشکاوانە ڕایناگەیەنین؟ لەوانەیە لەبەر ئەوەبێت ئەگەر کەسێك هاوڕانەبێت لەگەڵماندا و ڕەخنەمان لێبگرێت، زۆرم پێناخۆش دەبێت و وادەزانم ئەگەر منیش ڕەخنە لەکەسێك بگرم، ئەویش زۆری پێناخۆش دەبێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە بەمجۆرە نییە. لەوانەیە من بەڕێگە ڕاستەکەیدا بڕۆم و بەرامبەرەکەیشم زۆر سوپاسم بکات.

***

ئەمە هۆکاری زۆری هەیە، بەڵام یەکێك لەهۆکارەکانی ئەمەیە کە ئێمە چاوەڕوانیمان لە خۆمان هەیە کە مرۆڤێکی بێ عەیب و کەموکوڕی بین. من ئەم یارییە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکەم کە بەشداری لە خول و پلەکانی مندا دەکەن و ئەمەوێت تکا لە ئێوە بکەم هەر ئێستە بەیەکەوە ئەم یارییە ئەنجامبدەین. هەر ئێستە لە خۆتان بپرسن کە ئێستە زیاتر دەزانن یان ساڵی ڕابوردو؟ بەدڵنیاییەوە دەڵێن: (ئێستە) سوپاستان دەکەم. باشە ئەی ساڵی ئایندە زیاتر دەزانن یاخود ئێستە؟ ئێوەش دەڵێن ساڵی داهاتو! سوپاستان دەکەم. لەبەر ئەوەی کە ئێمە بەرەو گەشەسەندن دەچین، ئایا دەتوانین لەم دوو پرسیارە ئاوا دەرئەنجام وەربگرین کە شتانێك لە ساڵی ڕابوردودا هەبون و ئێمە نەمانزانیون و ئەمساڵ دەیانزانین، واتە فێری بوین؟ بەڵێ هەروایە. چونکە شتانێك هەن کە ئێستە ئێمە

نایانزانین و له ساڵی داهاتودا فێریان دەبین. ئایا لەبەر ئەوەی که ئێسته شتانێك نازانم و بواری گەشەکردنم هەیە، دەبێت لەگەڵ خۆمدا خراپ بم؟ جەنابی بەڕێوەبەر باشه بۆچی چاوەڕوانیت لەخۆت هەیە که لەسەروو هەموانەوه بیت؟ باوکی ئازیز باشه بۆچی چاوەڕوانی ئەوەت هەیە که هەموو قسەکانت ڕاست بن و هەموو ئەندامانی خێزان شوێنت بکەون؟ دایکی بەڕێز بۆچی وابیردەکەیتەوه که قسەی ڕاست لەماڵەوه تەنها تۆ دەیکەیت و هیچ شك و گومان و دودڵییەك له زانست و داخوازییەکانتدا نییه؟ کوڕی خۆم، کچی خۆم، بۆچی ئەو چاوەڕوانیەتان لەخۆتان هەیە که بێ کەموکوڕی بن؟ مەگەر نەزانین عەیبەیە؟ ئەگەر نەزانیت و نەتەوێت فێر ببیت ئەوه عەیبه و کەموکورتیه.

***

با بێین و ڕێگەنەدەین که ئاسمانی ژیانمان تەختی زەوی ببێت و زەویەکەیشی بلکێت به ئاسمانەکەیەوه. ڕێگه نەدەین بارودۆخەکان شێواوو نالەبار بن. کاتێك کەسێك ڕێنماییمان دەکات، با سوپاسی بکەین. کاتێك کەسێك به نیەتی باشەوه، دیدگایەك (ئیتر ڕاست بێت یان هەڵه) مان لەگەڵدا باسدەکات، پێویست ناکات که هاوڕابین لەگەڵیدا، بەڵام سوپاسی بکەین که کاتی خۆی به ئێمه بەخشیوه و بوێری ئەوەی هەبووه که بیرو بۆچون و دیدگاکانی خۆی به ئێمه بڵێت. ئێوەش خوێنەرانی ئازیز، دەتوانن هەر ئێسته بڕیار بدەن و کارێك بکەن که هەرگیز له ئێسته بەدواوه ئاسمانی ژیانتان تەختی

زەوی نەبێت، بەومەرجەی کە هەر لەئێستەوە ئەم دووکارە ئەنجامبدەن: یەکەمیان ئەوەیە سوپاسگوزار بین بەرامبەر هەر خزمەتگوزارییەکی تایبەت کە پێشکەشمان دەکرێت، یان هەر هەواڵێك کە پێمان دەدرێت، تەنانەت لەبەرامبەر ئەو ڕەخنەیەشەوە کە لێمان دەگیرێت، پێویستە سوپاسگوزاری مرۆڤە ڕەخنەگرە بنیاتنەرەکان بین. بەشداری بکەن لە خولەکانی نەهێشتنی ترس و تەریقبونەوە و قبوڵکردنی ڕەخنەدا، بۆ ئەوەی بەخێراییەوە ئەمشتانە فێر ببن. دووەمیش: هەرکاتێك شتێکتان دەوێت، لەبری فەرمانکردن، تکابکەن و بڵێن (بێزەحمەت) (تکات لێدەکەم) (سوپاست دەکەم). دڵنیابن ئەگەر ئەمشتانە بەکار بهێنن، هەمیشە ئاسمان و زەوی ژیانتان لە جێگەی خۆیدایە و ئێوە ئارامتر و بێ دەردیسەرتر و خۆشەویستتر ژیانی خۆتان دەگوزەرێنن.

# ئاگاداربە کە چی دەڵێیت

ئێمەی مرۆڤ هەندێکجار کەمتر سەرنج دەدەینە ئەو شتانەی کەفراوانن و ڕەواج و باویان هەیە و لەوانەیە بێئاگابین لە ڕۆڵ و گرنگیان. یەکێك لەو شتانەی کە زۆر گرنگە و ڕۆڵێکی زۆر سەیری لە ڕێژەی بەختەوەری و خۆشبەختی ئێمەدا هەیە، بریتیە لە قسە و گوفتارەکانمان. مرۆڤە ئاقڵەکان هەمیشە بیردەکەنەوە کە چی بڵێن. لەم یاداشتەدا، بابەتی قسەکانمان ئەمەیە کە گوفتارمان چ کاریگەرییەکی لەسەر ڕۆحیەت و چارەنوسی ئێمە دەبێت. زیادەڕەوی نییە ئەگەر بڵێین تۆ دەبیتە ئەوەی کە دەیڵێیت...!!

***

بەدڵنیاییەوە سەرنجی ئەوەتان داوە مرۆڤ کاتێك دەچێت بەڕێگادا و دەژی و بێدارە، هەمیشە مێشکی لەکارو چالاکیدایە و دەرەئەنجامی ئەم چالاکیەش بریتیە لە قسەو گفتوگۆیەکی دەرونی لەگەڵ خۆیدا. مرۆڤ هەمیشە قسە لەگەڵ خۆیدا دەکات. هەندێك هێدی هێدی و هەندێکیش بەدەنگی بەرز ئەو قسانە دەکەن. بەڵام هەموان لەگەڵ خۆیاندا قسە دەکەن. ئێوەش خەریك لەگەڵ خۆتاندا قسە دەکەن. منیش لەگەڵ خۆمدا قسە دەکەم. ئەو ڕستانەی کە من هەروا خەریکم

لەبەر خۆمەوە دەیانڵێم، ئەمانە ئایندە، چارەنوس و ڕۆحیەتی من دروستدەکەن. دەڵێن چۆن؟ دەی تاقیبکەنەوە. یەك سات سەرنج بدەنە خۆتان، خەریکن چی بە خۆتان دەڵێن؟ ئەگەر خودای نەکردە مرۆڤێکی خەمۆکن، قسەکانتان لەگەڵ خۆتاندا ئەمەیە کە: ئەمە چ ژیانێکە؟ ئەم ژیانە چ سودێکی هەیە؟ بۆچی من هێندە بەدبەختم؟ بۆچی خەڵکی ستەمکارن؟ باشە کۆتاییەکەی چی؟ من ناتوانم، من ناچارم ئەمکارە بکەم، من دەبێت ئەمکارە ئەنجامبدەم، من نابێت ئەمکارە بکەم....هەمیشە لەمجۆرە قسانە لەگەڵ خۆتاندا دەکەن. ئەگەر مرۆڤێکی سەرکەوتویش بن دەڵێن: ئەمکارە دەکەم، دەچم بۆلای ئەم و دەچم بۆ لای ئەو.... هەمیشە لەگەڵ خۆتاندا قسەگەلێك دەکەن کە ڕۆحیەتان بەرز دەکەنەوە. لە ئەمریکادا لێکۆڵینەوەیەکیان ئەنجامداوە کە هەڵسەنگاندنیان لەسەر دەستەواژە و کاریگەرییەکانی لەسەر ڕۆحیەتی مرۆڤەکان کردووە. حەزدەکەم ئەمە لەگەڵ ئێوەدا دابەشبکەم.

***

ئەم لێکۆڵینەوەیە گەیشتوە بە دەرئەنجامگەلێکی زۆر سەرنجڕاکێش. لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەوە نیشاندراوە کە دوو بەش لەو ڕستە و ووشانەی کە ئێمە بەکاریان دەهێنین، کاریگەرییان لەگەڵ قسەکانیتردا زۆر جیاوازە، ئەوانیش بریتین لە COULD BE-SHOULDBE (دەبوایە) و (توانین) هەرکاتێك من وەك مرۆڤێك پێکهاتەیەك لە دەبوایە و توانین، بەکار دەهێنم، دەبێت زۆر زۆر

ئاگادار بم. دەبوایە، واتە من دەتوانم یان ناتوانم. ئەمکارە دەکرێت یان ناکرێت. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ توانینSHOULDBE. واتە دەبێت ئەمکارە بکەم و نابێت ئەمکارە بکەم، COULD BEواتە ئەمکارە دەتوانم بکەم یاخود ناتوانم، کاتێك ئێوە ئەم دوو گروپە بەکار بهێنن، واتە ئەگەر بە خۆتان بڵێن کە من ناتوانم ئەمکارە ئەنجامبدەم، ئەمە ڕستەیەکی خەبەری نییە کە بە خەڵکی و بە دایکوباوك و بە هاوسەر و دایك و شەریکەکەتان دەیڵێن. ئەمە ڕستەیەکی دەستورییە کە سیستەمی دەرونی مێشك و ئەعسابتان دەری دەکات، ئەگەر کەسێك بڵێت ناتوانم ئەمکارە ئەنجام بدەم، لەناو مێشکدا بەمجۆرە تەفسیر دەکرێت: (من نابێت ئەمکارە ئەنجامبدەم، چونکە ناتوانم بیکەم) و ئەنجامیشی نادەن. ئەگەر ئێوە بە خۆتان بڵێن من دەبێت ئەمکارە ئەنجامبدەم، پێش ئەوەی کە بە خەڵکی یان بە خۆتان شتێك بڵێن، فەرمانتان بە مێشکی خۆتان کردووە کە کارەکە ئەنجامبدرێت و مێشك دەچێت بۆ ئەوەی کارەکە ئەنجامبدات. یان دەڵێیت نابێت ئەمکارە بکەم، مێشکیش فەرمان دەردەکات کە ئەمکارە مەکە، ئەگەرچی توانای ئەنجامدانیشی هەبێت. کەوابوو کاتێك کرداری دەبوایە و توانین بەکار دەهێنن، دەبێت زۆر ووریا بن، چونکە پێش ئەوەی کە هەواڵێك بێت بۆ خەڵکی، فەرمانێکە بۆ خۆتان کە ئەمکارە ئەنجامبدەن یان ئەنجامی نەدەن و نەیکەن.

***

کەوابوو ئەم دوو گروپەمان ناسی، ئێستە با بزانین چ سود و کەڵکێکیان لێوەربگرین. لە ئێستە بەدواوە ئەوە بەبیری خۆتان بهێننەوە کە پێش ئەوەی بتانەوێت سەبارەت بە بابەتێك قسە بکەن و دواتر بڵێن دەتوانم یان ناتوانم، دەبێت ئەنجام بدەم یان ئەنجام نەدەم. چونکە لەوکاتەدایە کە سیستەمی جەستەتان بەو ئاراستەیەی کە بەرژەوەندی ئێوەیە دەست دەکات بە جوڵە. چونکە پێشتر بیرتان کردوەتەوە. ئەمەش ڕێگەیەکە بۆ چونە ناو زەمیری ناخودئاگای خۆتان و ئەوەی کە بتوانن خۆتان کۆنترۆڵ بکەن. بڵێن من دەبێت ئەمکارە بکەم، من دەبێت واز لە جگەرەکێشان بهێنم، ئەوکاتەیە کە مێشکی ئێوە دەچێت بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە تەرك بکات و وازی لێبهێنێت. ئەگەر بڵێن من دەتوانم واز لە جگەرە کێشان بهێنم، من دەتوانم سەروسامانێك بە ژیانی خۆم بدەم، من دەتوانم دەوڵەمەند ببم، من دەتوانم خۆشحاڵ بم.... دواتر مێشکی ئێوە لەمبارەیەوە دەستدەکات بەکارو جوڵە. تەنها هێندە بەسە کە پێی بڵێن.

***

بابەتی دووەم کە حەزدەکەم بگەڕێینەوە بۆ سەری، ئەمەیە کە ماوەیەکی زۆرە خەریکین سود لە دەبوایە و توانین وەردەگرین. بەبێ ئەوەی کە بزانین زەمینە نەرێنیەکان چین؟ هەمان ئەو داب و نەریتە نەرێنیانەی کە ئێمە لەمنداڵیدا فێریان بوین. ئەو مرۆڤانەی کە لەمنداڵیدا سوکایەتیان پێدەکرێت و پێیان دەگوترێت: بێ غیرەت، شپرزە، سەیری خوشکەکەت بکە، سەیری براکەت بکە، سەیری کوڕە

مامەکەت بکە، سەیری منداڵی خەڵکی بکە، باشە ئاخر تۆ تاکەی دەتەوێت ببیت بە شتێك، تۆ هەرگیز نابیت بە هیچ... گوتنی ئەمجۆرە قسانە بە منداڵ، زۆر زۆر کوشندەن. منداڵ کاتێك ئەم قسانە لە مامۆستا و خەڵکانی دەوروبەر و دایکوباوکی خۆیەوە دەبیستێت، بەباشی باوەڕیان پێدەکات.

***

هاوڕێیەکم هەبوو کە دراوسێیەکی هیندیان هەبوو. بۆ دەگێڕامەوە کە ئەوان منداڵێکی کچیان بوو، دایکەکە کاتێك سەرقاڵی تەڕو وشککردنی کچەکەی بوو، پێی دەگوت کچە جوانەکەم تۆ گەورە دەبیت، دەچیتە قوتابخانە، سەرکەوتو دەبیت، هاوسەرگیری دەکەیت، هاوسەرەکەت زۆر خۆشدەوێت، خانەوادەی هاوسەرەکەیشت تۆیان زۆر خۆشدەوێت، تۆ کەسێکی زۆر خۆشبەختیت. منیش هەروا لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە ئەی هاوار بە ماڵمان ئێمەش چی بە منداڵانی خۆمان دەڵێین! دەڵێین دایەگیان ئاگات لە خۆت بێت، دایەگیان وریابە هاوسەر بەوجۆرەیە، خوشکی هاوسەر بەمجۆرەیەو....هتد. ئەگەر من باوەڕ بەوە بکەم کە دایکی خێزانم کەسێکی بێزارکەرە لە ژیانی مندا. ئیتر ئەو خاتونە هەرچی ڕێزو خۆشەویستیم بۆ بنوێنێت، دەڵێم نەخێر، بەدڵنیاییەوە ئەم ماستە مویەکی تێدایە، چونکە بیرو باوەڕم بەپێچەوانەوەیە.

***

با هێزو توانای خۆمان بزانین. هەر لە ئەمڕۆوە منداڵەکانتان، هاوسەرتان، هاوکار و هاوشاریەکانتان و هەرکەسێك کە لەکارکردندا لەگەڵتاندایە، دەتوانن بەرنامەڕێژی بکەن بۆ ئەوەی بگەن بە سەرکەوتن، ئەمە پەیامێکی زۆر زۆر جوانە، یەکێك لەو ڕێگایانەی کە دەتوانێت جوانی شاراوە و نوستوی مرۆڤەکان بێدار بکاتەوە، هەر ئەمەیە. با متمانە بەخۆبون و ڕێزگرتن لە خۆیان پێببەخشین. بیانگەیەنینە ئەوباوەڕەی کە تۆش کەسێکیت بۆ خۆت. باوەڕ بکەن هەرگیز جێگەی ئێمە و ئێوە تەنگ و لەق ناکەن. چیرۆك و بەسەرهاتی تیمونیەتان بەبیر دەهێنمەوە، کە مەکینەی خەیاتی داهێنا. خەیاتەکانی ئەو سەردەمە ئەویان کوشت، چونکە وایاندەزانی مەکینەیەکی داهێناوە خێرا دەدورێت دەبێتە هۆی بێکاری و بێ ئیشی ئەوان. ئێستە دەزانن کە هەڵەیان دەکرد: خۆ ئێستە ئەم هەموو مەکینەی خەیاتیە هەیە، مەقەست وکەرەستەی جۆراو جۆری خەیاتی هەیە و هەموان خەریکی بەرگدروین. زۆربەشیان ناتوانن لەکاتی خۆیدا جلوبەرگە کانتان بۆ بدورن و بتاندەنەوە! باوەڕ بەوە بکەن کە گەشەی ئێمە گەشەی خەڵکانیتریشە، دەبێت باوەڕیش بەوە بکەین کە من و ئێوە دەتوانین گۆڕانکاری بەدی بهێنین. دەبێت ئەم باوەڕەمان هەبێت و نەڵێین من کێم و چیم. دەبێت باوەڕ بەوە بکەین کە بەهۆی قسە و نەریتەکانمانەوە دەجوڵێین و دەبێت لە ڕیزبەندی قسەو گوفتارەکانماندا وردەکاری بکەین. من ناتوانم، من کەسێی

ئەوتۆ نیم... با ئەمجۆرە قسانە فرێبدەین و لە خۆمانیان دور بخەینەوە.

***

ئێوە کەسێکن بۆ خۆتان و ئەوەندەش گرنگن کە من هاوشێوەکانی من خەریکن ئەم کتێبە بۆ ئێوە دەنوسن و ئامادەی دەکەن. ئێوە گرنگن، دەبێت بابەتەکان ئەوەندە سەرنجڕاکێش بن کە ئێوە کاتی خۆتان تەرخان بکەن بۆ ئەوەی بیانخوێننەوە. ئێوە گرنگن و بیرو بۆچونیشتان گرنگە. ئەگەر لەم گرنگیە تێبگەین، ئەوکات لەڕێگەی گوتنەوە کۆنترۆڵی خۆمان دەکەین. ڕستە ئەرێنی و جەختیەکان زۆر بڵێنەوە و دووبارەیان بکەنەوە: (من خۆمم خۆشدەوێت! من کەسێکی خۆشەویستم!) کاتێك ئێوە ئەمە دووبارە بکەنەوە، مێشکتان بەرنامەڕێژی دەکات و وەك هاوڕێیەك لەگەڵتاندا دەجوڵێتەوە. لەبەرخۆتەوە جەختی لەسەر بکەرەوە و بڵێ (من لە هەر حاڵەتێکدا بێت ڕێگەچارەی کێشەکان دەدۆزمەوە!) جەختی لەسەر بکەرەوە و بەردەوام بەخۆتی بڵێرەوە. کاتێك مێشکت بۆ ئەمە بەرنامەڕێژی کرا، ئیتر هیچ کێشەیەك نییە کە بتانترسێنێت. بەدڵنیاییەوە ڕێگەچارەکەی ئەمڕۆ یان بەیانی یاخود دوو بەیانی هەر دەدۆزنەوە. لەگەڵ خۆتدا قسە بکە و ورد ببەرەوە و کاتێك (دەنگی بچوك) پەخش دەکرێت چ دەنگێکە؟ ئەگەر نەرێنی و خەمۆك و کوشندەیە، یەکسەر بیبڕەوە. ئەو هاوڕێیانەم کە ئیمەیل دەنێرن و دەڵێن خەمۆك و ناسەرکەوتوین و بارودۆخمان خۆش نیە، سەرنج بدەنە ئەم دەنگە

بچوکەی خۆتان. ئێوە داواتان لە ئێمە کردوە کە ڕێنماییتان بکەین کە چی بکەن. هیچ، تەنها سەرنج بدەن و لەوە ورد ببنەوە کە چی بەخۆتان دەڵێن، بە گوتن و بە ڕیزکردنی ڕەستەکانی خۆتان بەرنامەڕێژی بۆ ژیانی خۆتان ئەنجامبدەن. ئەوکات ئێوە دەبنە هەمان ئەو کەسەی کە هەمیشە لەبەرخۆتانەوە دەیڵێینەوە.

***

لێرەدا ئاماژە بە یاسایەك دەکەم بەناوی (یاسای چاوەڕوانی)، کە بەپێی ئەم یاسایە ئێمە شتێکمان دەستدەکەوێت کە چاوەڕوانی دەکەین بۆمان ڕوبدات. ئەگەر ئەمڕۆکە لەماڵەوە دێیتە دەرەوە و لەبەر خۆتەوە دەڵێیت ڕۆژێکی پڕ لە شادی و سەرکەوتنە بۆ من، دڵنیابە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر خۆش دەبێت. ئەگەر تەڵقین بە خۆت بکەیت کە من مرۆڤێکی سەرکەوتوم و لە هەرحاڵەت و بارودۆخێکدا بێت ڕێگەچارەی کێشەکان دەدۆزمەوە، ئەوکات یاسای چاوەڕوانیش یارمەتیت دەدات و هەرکێشەیەکت بۆ بێتە پێشەوە، ڕێگەچارەسەرەکەیشی دەدۆزرێتەوە. هەربۆیە یاسای چاوەڕوانی زۆر بە جیدیەوە وەربگرن. ئەگەر بێت و بەردەوام بە خۆتان بڵێن من ناتوانم، من نابێت ئەوە بکەم، دڵنیابن هەمان ئەو شتە بۆ ئێوە دێتە پێشەوە و ڕوودەدات.

## سەرمایە ڕاستەقینەکانی تۆ کامانەن؟

ئایا تاوەکو ئێستە پرسیارتان لە خۆتان کردوە کە ئایا بەڕاستی سەرمایە ڕاستەقینەکانی ئێمە کامانەن؟ ئێمە وەك مرۆڤێك چ شتێکمان هەیە کە بتوانین حیسابیان لەسەر بکەین و بڵێین ئەمە سەرمایە و دەستمایەی ئێمەیە؟ لەوانەیە بڵێین بڕوانامە یان ئەو موڵکەی کە هەمە، یاخود ئەوپارەیەی کە لەبانکدا دامناوە، یاخود ئەوەی کە منداڵی باشم هەیە، هاوسەرگیریم کردووە، ڤێلایەك یاخود ئەو ئۆتۆمبیلەی کە هەمە و...هتد. با یەك قۆناغ بچینەدواوە. باشە ئەم بڕوانامەیەمان چۆن بەدەستهێنا؟ چیمان داوە کە ئەم بڕوانامەیان پێداوین؟ ئەم ئەزمون و زانستەمان لەبەرامبەر چ شتێکدا وەرگرتوە؟

***

ئەگەر بەوردییەوە قوڵ ببینەوە و سەرنج بدەین، بەخێراییەوە دەگەین بەم وەڵامە. هەرشتێك کە ئێمە لەم دونیا گەورەو فراوانەدا بەدەستی دەهێنین، لەبەرامبەر و لەبریدا شتێك دەبەخشین. واتە سەودا و مامەڵە دەکەین. باشە ئەم سەودا و مامەڵەیە چییە؟ ئێمە چ شتێك دەدەین و لەبەرامبەریدا چی وەردەگرین؟ لەوانەیە بڵێین

پارەیە. بەڵام ئایا ئەو پارەیە لە کوێوە هاتوە؟ شتێك هەیە کە لە ناو هەموو ئەمانەدا هاوبەشە، ئەویش بریتیە لە (کات).

ئێمە هەمومان وەك مرۆڤ، کاتێکی سنوردارمان هەیە بەناوی (تەمەن.) ناوەندی تەمەنیش دیارو ئاشکرایە. ئەگەر لە ئاراوتە(استثناء)کان تێپەڕین، ناوەندی تەمەن لە ئێراندا ٧٠ و ئەوەندە ساڵە، بۆ نمونە لە یاباندا ٨٠ و ئەوندە ساڵە. منی منداڵی مرۆڤ کە دێمە دونیاوە، تاوەکو ئەوکاتەی کە کۆچی دوایی بکەم، دەبمە خاوەنی کۆمەڵێك شت. کاتێك بەباشی ورد ببنەوە دەبینن ئەم مرۆڤە تەمەنی خۆی دەبەخشێت و دوو ووشە فێر دەبێت. هەموو تەمەنی خۆی دادەنێت بۆ ئەوەی بڕوانامەیەك وەربگرێت. یان تاوەکو خانویەك بکڕێت. کاتی خۆی کە هەمان تەمەنەکەیەتی لە فەرمانگەیەکدا بەسەر دەبات و ئیش و دەکات و پارە پاشەکەوت دەکات، بۆ ئەوەی شتێك بەدەست بهێنێت. لە ڕاستیدا لەبەرامبەر هەرشتێك کە لەژیاندا بەدەستی دەهێنین، کات یاخود تەمەنی خۆمان دەدەین. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە ناتوانین ئەم سەرمایە بەنرخە پاشەکەوت بکەین. ئەگەر شتێك بەدەست بهێنن و ئەگەریش هیچ شتێك بەدەست نەهێنن، ئەوا ئەم تەمەنە هەر تێدەپەڕێت و لەدەست دەچێت. ئەم سەرمایە وەك بەفر وایە لەبەرامبەر تیشکی خۆرەوە. دەتوێتەوە. هەروەك سەهۆڵ وایە دەبێت بە ئاوو نامێنێت. کەوابوو ئەگەر دەتوانن سودی لێوەربگرن، بۆ ئەوەی بەبێهودە لەدەست نەچێت.

***

ئەمەوێت پێشنیارێك بۆ ئێوە بکەم. پێشنیاریشم ئەوەیە کە یەکەم ئاگامان لە خۆمان بێت و ئاگادار بین، کە تاکە سەرمایەمان کە کات و تەمەنە، (هەموو شەوو ڕۆژێکی ٢٤ سەعاتە) زۆر زوو تێدەپەڕێت. ئەگەر ڕۆژێك ویستتان بزانن کە تەمەنتان چەندە زوو تێدەپەڕێت، لوتف بکەن و کۆمەڵە وەسڵێکی ماڵەوە هەڵگرن و سەیری بکەن. لاپەڕەکانی هەڵدەنەوە و بزانن یەك ساڵ چەندە خێرا تێپەڕیوە. زۆرێك لە ئێمە نازانین کە خەریکە چەندە سەرمایە لەدەست دەدەین. کاتی خۆمان دەکوژین. تەنانەت هەندێك پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە تەمەنیان بگوشرێت! چاوەڕێ دەکەن کۆتایی و سەری مانگ بێت و موچەکەیان وەربگرن. یاخود چاوەڕوانن کۆتایی هەفتە بێت و کارێك ئەنجامبدەن. لەوساتەی کە تێیدان، هیچ چێژ و خۆشییەك وەرناگرن. بۆ ئاگاداریتان ئەوەتان عەرز بکەم کە من و ئێوە وەك مرۆڤ سێ سەرچاوەی زۆر سنوردارمان هەیە. ١ – تەمەن. (کە دەکاتە هەمان ئەوکاتەی کە باسی دەکەین) ٢ – فیکر. ٣ – ووزە. واتە ئەگەر ماندوببین، لەگەڵ ئەوەی کە کاتمان هەیە، بەڵام ناتوانین هیچکارێك ئەنجامبدەین. هەربۆیە دەبێت ووزەمان هەبێت و تەندروست بین. ئەگەر بیرو فیکرمان کار نەکات نە ووزە و نە ئەو کاتەش کە هەمانە، نەك بە کەڵکمان نایەت، بەڵکو لەوانەیشە بە زیانمان تەواو ببێت. ئەو کەسەی کە بیرو فیکری کار نەکات، لەوانەیە هەرچیەکی هەیە لەدەستی بدات.

***

لە هەرساتێکدا تەنها یەك فیکرمان هەیە، یەك ووزە و یەك کاتمان هەیە. بەم سیانەیە کە مرۆڤەکان دەگەن بە خواست و ئارەزوەکانیان. هەندێك دەگەنە بەرزترین پلە –ئیتر چ مەعنەوی بن یان مادی یاخود کۆمەلآیەتی و ئابوری– هەندێکیتریش تاوەکو کۆتایی تەمەن بەو یەك فیکر و یەك ووزە و یەك کاتەوە، لە حەسرەتی ژیانێکی ئاساییدا، کۆچی دوایی دەکەن و دونیا بەجێدەهێڵن. بابزانین ئەمەبۆچی؟ چونکە ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەو سەرچاوانەدا نیە کە هەیانە و بەباشی سود و کەڵکیان لێوەرناگرن. با بێین و لەسەر کاغەز بنوسین. بە دارو دیوار و دەرگای ماڵەکەمانەوە هەڵیبواسین: من تەنها یەك (فیکر) یەك (کات) و یەك (ووزە)م هەیە. سەیر و سەمەرەو بە ئازار ئەوەیە کە من هەمیشە خەریکم بۆڵە دەکەم. توڕەم. حاڵەتی تۆڵەسەندنەوە و شەڕوئاژاوەم هەیە. لەبیرم چوەتەوە کە فیکر و فەزای ڕۆح و زەینم پڕ بووە لە ڕق و کینە و توڕەیی. باشە فیکرم کە توڕەیی بێت، ئەوکات ووزەم لە دەرونەوە دەخورێت و کاتیشم بە فێڕۆ دەچێت. کەوابوو ناگەم بە هیچ شتێك. بێجگە لەمەش جەستەیشم نەخۆش دەکەوێت. زۆر سەخت و دژوارە، با بێین و باوەڕ بەوە بکەین کە هەبونی توڕەیی و نەفرەت، یەکەمجار و پێش هەموشتێك خۆمان دەکوژێت، سەرچاوە بەنرخەکانمان بەخێراییەوە لەناو دەبات و دەیانسڕێتەوە. ئەو کەسەی کە توڕە و ڕقاوییە، ووزەی پێویستی بۆ جوڵەکردن نییە، چونکە خۆی بەکاربەری هەمو ووزە و تواناکانی خۆیەتی.

***

ئەزمونەکان ئەوەیان نیشانداوە ئەو کەسانەی کە زۆر و لە ڕادەبەدەر بۆڵە بۆڵ دەکەن و ڕەخنەدەگرن و لەدەستی ئەم و ئەو تورە دەبن، شانسی سەرکەوتنیان زۆر لە خوارەوەیە و لە ئاستێکی نزمدایە. بەپێچەوانەشەوە، ئەو کەسانەی کە خۆشحاڵن (بەم مانایە کە ڕازین لەوەی کە هەیانە و سوپاسگوزاری خودان) شانسیان بۆ سەرکەوتن و بەدەستهێنانی ڕۆزی و فەرعانە زۆر زیاترە.

شکر نعمت نعمتت افزن کن

کفر نعمت از کفت بیرون کن

واتە: بە شوکرانەی نیعمەت و بەخششەکانی خودا نیعمەتی خۆت زیاد بکە. بە ناشوکری و کوفری نیعمەت، نازونیعمەتەکانی خودا لەدەستی خۆت دەربکە.

نیعمەت و بەخششەکان لەدەستی ئێوەدان. کوفری نیعمەت بەم مانایە کە من قەدری نازانم و بۆڵە دەکەم و ڕەخنە دەگرم و هەموو هەلە بەنرخەکانیش لەدەست دەدەم. ڕۆحیەتی شوکرانەبژێری و خۆشبینی و گەشبین بون، (بەمانای ئەوە نییە کە زیاترمان نەوێت و نەمانەوێت گەشە بکەین و پێش بکەوین. بەڵکو بەمانای ئەوەیە کە ئاگاداری ئەو سەکۆیە بین کە لەسەری دەژین و خودای گەورە لە نازو نیعمەتەکانی خۆی بۆ ئێمەی دروستکردووە)، ئەمەیان زۆر گرنگە.

***

ئێمە یەك فیکر و یەك کات و یەك ووزەمان هەیە. باشە چۆن و بە چ شێوەیەك ئەمە سەرف دەکەین و بەکاری دەهێنین؟ هەمیشە بیر لە ڕابورد و دەرد و ڕەنج و ئازارەکانی دەکەینەوە، لە ئێستادا ناژین، یان وەك (گوفی) لە خەیاڵی داهاتوداین و حاڵ و ژیانی خۆمان لەناو خەون و خەیاڵاتدا بەسەر دەبەین؟ خەون و خەیاڵ شتێکی خراپ نییە، بەڵام دەبێت لە جێگەی خۆیدا و بەومەرجە بێت کە نەبێتە ڕێگرمان لەبەردەم گەیشتن بە واقیع و ڕاستیدا. هەڵبژاردن لەدەستی من و ئێوەدایە کە لەسەر گۆڕەپان و ستەیجی دەرون و مێشك و فیکری ئێمەدا چ بیرۆکەیەك بوونی هەیە: هیواو ئومێد و شەوق، یاخود نەفرەت و ڕەنجان و گلەیی و گازندە لە ڕابوردو؟

***

پیشنیار بۆ ئێوە دەکەم هەر ئێستەوە بڕیار بدەن کە گۆڕەپانی فیکر و ڕۆح و دەرونتان بکەنە شوێن و هێلانەی شوکرانەبژێری و سوپاسکردن. لەوانەیە هەندێك بۆڵە بکەن و بڵێن (تۆ لە شوێنی گەرمەوە قسە دەکەیت!) بەڵام دڵنیابن بەوجۆرە نییە. ئەگەر بتوانیت ئەم ڕاهێنانە ئەنجامبدەیت، بزانە کە دەرگای نیعمەتەکانی خودا بەڕوتدا دەکرێتەوە. ئەو کەسانەی کە نەخۆشن، ئەی مەگەر ناتەندروست نین؟ هەر لەئێستەوە لەبری ئەوەی کە بیر لە نەخۆشیەکەیام بکەنەوە، با بیر لەوە بکەنەوە و بڵێن کە تەندروستن. لە حاڵەتی سەلامەتیەوە دەستپێبکەن. بەم ئازیزانە دەڵێم ئەگەر ئەم فیکرە، بەپێی پێویست لە بیرو زەینتاندا بپارێزن، هەستتان

دەگۆڕدرێت، حاڵتان باشتر دەبێت، سەیر ئەوەیە کە جەستەتان هەلی ئەوە پەیدا دەکات کە ئێوە ڕزگار بکات. هەندێك ئیمەیلم بۆ دەنێرن کە( ژیانمان زۆر سەخت و دژوارە، هەمیشە لە کێشە و گرفتداین. باشە کەی کێشەکان تەواو دەبن؟) تەواو نابن، لەبەر ئەوەی کە ئێمە نامانەوێت. ئێمە واقیعیەت و ڕاستیەکان دەئافرێنین. ئێمە خەریکین ئەم کێشە و گرفتانە بەدی دەهێنین و بەخۆیشمان نازانین.

***

کەسێك کە بەیانی تاوەکو ئێوارە بیر لە نەخۆشی دەکاتەوە، بەیانی تاوەکو ئێوارە خەمیەتی کە داهاتوی چی لێدێت، باشە داهاتو یانی چی؟ من نزیکەی ۳۰ خولەك پێشتر دەستمکرد بە نوسینی ئەم دەقە، ئێوە ئێستە لە ماوەی کەمتر لە دە خولەکدا گەیشتون بەم ڕستەیە. ئێستە ئایندە هەمان دە خولەکی بەردەم ئێوەیە. چەند خولەکیتر کە ئەم یاداشتە تەواو ببێت، ئایندە دەبێتە ئێستە. هەرچیەك کە ئێستە خەریکی بیری لێدەکەیتەوە، دەبێتە ئایندە و داهاتوی تۆ. ئەگەر ئێستە لەم ساتەدا ئێمە بیر لە ڕابوردو، بیر لەتاڵیەکان، ناکامی و مەسەلە و کێشە و گرفتەکان بکەینەوە، بەردەوام بەرەو ڕابوردو ڕابکەین و پەنای بۆ بەرین، ئەوە ئێستامان لەدەستدەدەین. چونکە ڕابوردو ڕادەکێشین و دەیلکێنین بە ئێستاوە. بەمشێوەیە ڕابوردو دەخەینە ناو دڵ و جەرگەی ئایندەوە. باوەڕ بکەن داهاتوی ئێوە لەدەستی ئێوەدایە. باوەڕ بکەن ئێوە و نەتەوەیەك هەر خۆتان ئایندە و داهاتوی خۆتان بونیات دەنێن.

بەباشی باوەڕ بەمە بکەن. بە بیرکردنەوە لەمە مرۆڤ خۆی ئایندەی خۆی دروستدەکات. بە هەمان ئەوفیکرە و ووزەیە کە کەسێك دەگاتە لوتکە و ئەویتر دەگاتە نزمترین پلەی پەستی و داماوی. هەربەو یەك دانە ووزەیە یەکێك دەگات بە گەورەترینی شتەکان و ئەویتر لە بچوکی خۆیدا دەمێنێتەوە. هەر بەو یەك دانە ووزەیە، کە تەنانەت هەندێك وەك (هیلین کلر) کە کەمئەندام بووە) بە تەرکیز و ووردەکاری و باوەڕەوە. چارەنوسی خۆی و خەڵکیشی گۆڕی.

***

گۆڕەپانی بیرو زەینتان پڕ بکەن لە عەشق و خۆشەویستی. نەوەك لەبەر ئەوەی کە منەت بکەن بەسەر کەسێکیتردا، بەڵکو بەزەییتان بەخۆتاندا دێتەوە و لوتفێك بە خۆتان دەکەن. کاتێك گۆڕەپانی ژیان پڕ بوو لە عەشق، ئیتر هەست و کات و ووزەت لەمەدا سەرف دەبێت. عەشق سازندە و بنیاتنەرە، پەڕوباڵ دەبەخشێت و هێزو ووزە بە مرۆڤ دەدات. ئێوە یەك دانە کاتتان هەیە. یەك دانە فیکر و یەك دانە ووزەیش. وریاو ئاگاداری جەستەی خۆتان بن. بە پێی پێویست بخەون. بە پێی پێویست پشوبدەن، بە پێی پێویست خواردن بخۆن، نە زیاتر و نە کەمتر. ئەگەر بەڕاست و دروستیەوە پارێزگاری لەم سیستەمە بکەن و بەکاری بهێنن، دەگەن بە شوێنێك کە بێجگە لە خودا کەسیتر نابینن. واتە دەگەن بەوپەڕی هێز و توانا و لێهاتنەکان. ئەمە هی من و ئێوەیە. بەم یەك دانە سەرچاوەی فیکر و یەك دانە سەرچاوەی ووزە و یەك دانە سەرچاوەی کاتەی کە هەتانە، پەیمان

بەخۆتان بدەن کە گۆڕانکاری دروستبکەن. هەر لەئێستەوە دەستپێبکەن. ئەوەش بزانن کە بیرکردنەوەی ئەرێنی دەستپێکەکەیەتی. ووەزە دەخەمە دوای فیکرێکی ئەرێنیەوە و دەستدەکەم بە جوڵە. ئەگەر تەندروستیت لە مەترسیدایە، هەر لەئێستەوە بیر بکەرەوە کە تەندروست و سەلامەتیت و چەندینجار بەخۆت بڵێ (من سەلامەتم! من خۆمم خۆشدەوێت! من دەتوانم!) ئەمە بڵێی و بزانە ئەم ئەندێشە ئەرێنیە چۆن وردە وردە فراوان دەبێت و هەموو بون و وجودت داگیر دەکات و ئایندە و داهاتوت هەمان ئەوشتە دەبێت کە ئێستە خەریکیت دووبارەی دەکەیتەوە.

***

رسد ادمی به جایی که بەجز خدا نبیند

بنگر تا چ حد است مقام ادمیت!

واتە: مرۆڤ دەگات بە شوێن و ئاستێك کە بێجگە لە خودا کەسیتر نابینێت. سەیرکە و بزانە لە چ ئاستێکی بەرزدایە پلە و مەقامی مرۆڤایەتی.

## تاکە هەڵی نوێکردنەوە

نازانم ئەوەتان بۆ وەپێش هاتوە یان نا کە لە خۆتان بپرسن: (هەندێك لەوکارانەی کە ئەنجامیان دەدەم، هۆکارەکەیان دەزانم یان نا؟) زۆرێك لە داب و نەریتەکانی ئێمە بەمجۆرەن و بەپێی نەریت ئەمکارانە ئەنجامدەدەین، هەندێك لە داب و نەریتەکان، زیانیان نییە و سودیشیان نییە. هەرچەندە هۆکارەکەشیان نەزانین. بەڵام هەندێکیتریان زیانبەخشن، کات و ووزەی ئێمە دەگرن و ژیان خاو دەکەنەوە و لەسەرشانمان قورسی دەکەن. بەڵام هێشتا ئێمە خەریکین ئەنجامیان دەدەین، بەبێ ئەوەی کە پرسیار لە خۆمان بکەین. لەوانەیە یەکێك لەکارە باشەکان ئەمە بێت کە هەندێکجار و ئەگەر بۆ یەکجاریش بووە هەڵوەستە بکەین و لەخۆمان بپرسین: (باشە ئەمکارانەی کە بەدرێژایی ڕۆژ ئەنجامیان دەدەین بۆ چییە؟) حەزدەکەم داستانێکی ڕاستەقینەتان بۆ بگێڕمەوە کە لە کتێبێکی کۆمەڵناسیدا خوێندمەوە: پیاوێك لە هاوسەرەکەی پرسی: ئازیزەکەم باشە بۆچی کاتێك ماسی دەبرژێنێت، سەرو بنەکەی لێدەکەیتەوە؟ خاتونەکەش کەمێك بیر دەکاتەوە و هۆکارێك بۆ ئەمکارەی خۆی نادۆزێتەوە. دەڵێت ڕاستیەکەت بوێت ئەمکارە لەدایکمەوە فێر بوم.

ژن و پیاوەکەیش دەچن بۆلای دایکی ژنەکە و پرسیاری هۆکارەکەی لێدەکەن. دایکی ژنەکەیش کەمێك بیر دەکاتەوە و دەڵێت: منیش لە دایکمەوە فێری ئەم ئیشە بووم. هەرسێکیان(واتە پیاوەکە و ژنەکە و دایکی ژنەکە) دەچن بۆلای دایە گەورەی خێزانی کابرا و ئەم پرسیارەی لێدەکەن. دایەگەورەش دەڵێت: لەبەر ئەوەیە کە ئەوکاتە تاوەکەی ئێمە بچوك بوو ماسی گەورە تێیدا جێگەی نەدەبویەوە! هەمویان دەستدەکەن بە پێکەنین. تاوەی ماسی برژاندنەکەی دایە گەورە ٥٠ ساڵ لەمەوبەر بچوکبووە، هەربۆیە سەرو کلکی ماسیەکەی لێکردوەتەوە و قرتاندویەتی. کچەکەی سەیر ئەمەی کردووە و بەبێ ئەوەی کە هۆکارەکە بزانێت، فێری ئەمکارە بووە، کچی ئەم کچەش ئەمکارە لە دایکیەوە فێربوە و ئەویش بەبێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانێت ئەمکارەی دوبارە کردوەتەوە. واتە دایەگەورە و کچەکەی و نەوەی دایەگەورە. خۆ ئەگەر هاوسەری نەوەکەی دایەگەورە ئەم پرسیارەی نەکردایە، لەوانەبوو ئەمکارە درێژەی بکێشایە و دواتر و لەناو ئەو بنەماڵەیەدا ببوایە بە نەریت و هەر بەوجۆرە ماسیان ببرژاندایە!

***

سەردەمانێك پێویست بووە کە(پەیك) و نامەبەر بوونی هەبێت، بەڵام ئێستە کە ئینتەرنێت بوونی هەیە، خودی پۆستە و گەیاندنیش چوەتە ژێر پرسیارەوە. ئێستە لەسەرانسەری دونیادا خەڵکی گوڵ بۆ یەکتری دەنێرن، تۆڕێکی ئینتەرنێت هەیە و ئێوە گوڵ و جۆری

پێچانەوەی و ئەو ڕستەیەی کە لەسەری دەنوسرێت، لەگەڵ نرخەکەیدا باسی دەکەن و بەناوی خۆتانەوە دەینێرن بۆ ئەوسەری دوونیا. ئیتر هیچ پێویستناکات کە پۆستە بەکار بهێنن. زەمانە و سەردەم دەگۆڕدرێت و ئێوەش ناچارن کە بگۆڕدرێن. خۆ ئەگەر نەگۆڕدرێن، ئەوا دەبێتە هۆی گواستنەوەی کۆمەڵێك داب و نەریت لەلایەن ئێوەوە بۆ نەوەکانی دواترتان، کە هیچ پێویست نین و هەبونیان لەناو کۆمەڵگەدا گرنگ نییە وئەگەر زیانیان نەبێت ئەوا سودیشیان نابێت!

***

هەموو کەسێك تەنها یەك هەلی هەیە. یەك هەلی هەیە کە شتە نوێکانی ئەزمون بکات. وەك ماڵتەکاندن. بیانویەك نییە کە هەموو شتەکان لەلای خۆمان بهێڵینەوە. کاتێك کە بەکار نایەت، دەبێت فڕێی بدەینە دوورەوە و بیبەخشین بە کەسێك کە ئەو پێویستیەتی. بەداخەوە ئێمە بەهەموو هێزمانەوە ئەم هەلانە لەدەستدەدەین. هەریەکە لە ئێمە لەژیانماندا بەڕێگەگەلێکدا ڕۆیشتوین کە تەنانەت ناشزانین بۆچی چوین. سەرو کلکی ماسیەکە لێدەکەینەوە بەبێ ئەوەی کە بزانین بۆچی. دەبێت چاوەکانمان بشۆین و بەجۆرێکیتر سەیر بکەین. ڕێگە بدەین ئەم هەلە ئاڵتونیە بۆ ئێمە ئاشکرا ببێت. هەر لەمنداڵییەوە لاوەکانمان بگۆڕین بە مەکینەی داهێنان. لەوانەیە باشتر وابێت کە بڵێم پێویستە ڕێگری لە داهێنان و شارەزاییەکانیان نەکەین. لەگەڵ شێوازی ڕەفتار و پەروەردەیاندا کارێك نەکەین کە

خەلاقیەت و داهێنانکاریان کە بەشێکە لە بون و وجودی مرۆڤ و بەخششی خودای گەورەیە، لەناو بچێت.

تاکە ڕازی مانەوەی ئێمە بریتیە لە خەلاقیەت و داهێنەری و دۆزینەوەی ڕێگە نوێکان. منی جۆری(نوعی) لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا ئەمەوێت هەمان ئەو شێوازانە بەکار بهێنم کە لە گەنجی و لاویەتیدا لەبارەی کەسابەت و کاروپیشەوە فێریان بوم، کە ئەمەش نابێت. چونکە ئەمانە کارناکەن و دەبنە هۆی ئەوەی کە هەست بکەم شکستم خواردوە. ئەمە لەکاتێکدایە کە تەنها یەك کێشە بونی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ڕێگەیەکی نوێم لە کەسابەت و کارو پیشەکەمدا قبوڵ نەکردووە، فێری نەبوم، یاخود ڕاهێنانم لەسەر نەکردوە. وەرن با کارێك بکەین کە ماڵەکەمان و ژینگەی کاروپیشەکەمان بگۆڕین بە ماڵی نوێگەری و داهێنان. پرسیار بکەن، کتێبەکانی تایبەت بەو بوارە بخوێننەوە، هەر ڕێگەیەك کە دەتوانن پێیدا بڕۆن و فێر ببن کە چۆن دەتوانن داهێنەرانە و جیاوازتر بیر بکەنەوە، یەك ساتیش مەوەستن و دەستبەکار ببن. ئەمە تاکە ڕێگەی سادە و ئاسانە بۆ گەیشتن بە ژیانێکی باشتر. با ئەم هەلە لە منداڵەکانمان، لە لاوەکانمان نەسەنینەوە، لەکاتی خۆیدا کەمێك بکشێینە دواوە و ڕێگە بدەین منداڵەکانمان کەمێك خۆیان دەربخەن. لەوانەیە هەندێکجار خراپ نەبێت ئێمە بچینە دواوە و هەروەك دەڵێن گەنجەکانمان بکەونە بەرەتاو و هەلەکانیش بەوان بدەین. با وانەزانین کە ئێمە هەموو ئیش و کارەکان دەزانین. تەنانەت ئەگەر لێپرسراوی شوێنێکین و کارێکمان

له ئەستۆدایە، باکەمێك خۆمان بکشێنینە دواوە و ئەوان سەربەست و ئازاد بکەین و کاروبارەکانی خۆیان بەوان بسپێرین. دەتوانین ئەمکارەش لەماڵەوە ئەنجامبدەین. داوا لە منداڵەکانتان بکەن لە هەفتەیەکدا یەك ڕۆژ هی ئەوان بێت و تایبەت بێت بەوانەوە، کە خواردن دروست بکەن، ماڵ و ژورەکەیان بە ئارەزوی خۆیان ڕێکبخەن. ئەو وێنەیەی کە حەزیان لێیەتی بیکێشن. لە ژینگەیەکی زۆر ئازاددا بن، ئێمە بەپێی توانا هەوڵبدەین ئەو ژینگەیە فراوانتر بێت بۆ ئەوەی جگەرگۆشەکانمان گەشە بکەن.

***

بوار و کات بە منداڵەکانتان بدەن. لەژێر ناوو نیشانی (زانینی شتێکدا) پێیان مەڵێن ڕێگەی ڕاست و دروست لە فلانە کاردا ئەوەیە کە من پێیدا دەڕۆم. لەوانەیە ئەوان ڕێگەگەلێکی سادەتر بۆ خۆیان بدۆزنەوە. لەپاش هەرەسی یەکیەتی سۆڤیەت و پارچەپارچەبونی ئەو یەکیەتیە، زانایانی ئەمریکا چون بۆ ڕوسیا و سەردانی ناوەندە زانستیەکانیان کرد و دۆزینەوە و داهێنانەکانی ئەوانیان بینی. یەکێك لەو زانا ئەمریکیانە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنوسێت: ئێمە سەرسام بوین کە ئەمانە بە چ کەرەستەگەلێکی سادەوە، کارانێکی زۆر باشتر لەوەی کە ئێمە بە دەزگای زۆر پێشکەوتو ئەنجامیان دەدەین، بە ئەنجام گەیاندوە. چونکە بەپێی پێویست تەکنۆلۆژیایان لەبەردەستدا نەبوو، بەڵام هەموو ویست و مەبەستێکیان ئەوە بوو کە موشەکێك بنێرنە بۆشایی ئاسمان بۆ سەر مانگ. بە هەمان ئەو

تەکنۆلۆژیایەی کە هەیانبوو، بەلآم بە داهێنانکارییەوە، ڕێگەچارەگەلێکی زۆر سادەیان دۆزییەوە. ئەمە لەکاتێکدابوو ئەو کەسانەی کە بە سیستەمگەلێکی ئالۆزترەوە دەژیان، بەردەوام پێیانوایە ڕێگەچارەکان دەبێت ئالۆزو سەخت و دژوار بن. ڕۆژێکیان خەریکبوم باسی ڕێساکانی سەرکەوتنم بۆ کچەکەم دەکرد. سەیرێکی کردم و گوتی: بابە هەر بەڕاستی ئایا سەرکەوتن ئەوەندە سەخت و ئالۆز و دژوارە؟ لەوکاتەوە من تێگەیشتم و زانین کە بە فێرکارییەکان و بەو کتێبانەی کە خوێندومەتەوە نەخەڵەتێم. بەڵکو لەبری ئەوەدا بیر لەوە بکەمەوە کە چۆن ئەم ڕێکارانە بەشێوەیەکی سادە دروستبکەمەوە و ڕێکیان بخەمەوە و سەرلەنوێ دایانبڕێژمەوە. هەر لەبەر ئەمەبوو کە ئەم کۆمەڵە یاداشتەم نوسی.

***

ئەوەتان لەبیر بێت کە سەرکەوتن، بەشادومانی ژیان، خۆشبەخت و بەختەوەربون، سادەیە، بەو مەرجەی کە لەناو سیستەمە ئالۆزەکاندا بێینە دەرەوە و فێری ئەوە ببین کە شتانێکی نوێ قبوڵبکەین. هەمیشە لە خۆمان بپرسین: (ئایا ڕێگەیەکی سادەتر و کەم خەرج و کەم تێچوتر بوونی هەیە؟ دەتوانم چ کارێك ئەنجامبدەم بۆ ئەوەی ژیانم سادەتر و جوانتر و کەم خەرج بێت و تێچوی کەمتر بێت؟) بەدڵنیاییەوە هەمیشە کۆمەڵێك ڕێگەچارەی نوێ بوونیان هەیە. ئەگەر خۆمان بەبیرو زەینماندا نایەن و زەینمان ووشك بووە. با داوا لە

خەڵکانیتر بکەین لەوبوارەدا یارمەتیمان بدەن. دڵنیابن کە کاریگەری و دەرئەنجامی ئەرێنی دەبێت.

***

خوێنەری بەڕێزی ئەم کتێبە، بەبێ ئەوەی کە لە نزیکەوە ئێوە بناسم، بەڕێژەیەکی سەدی بەرزەوە دەتوانم لەبارەی ئێوەوە پێشبینی چەند شتێك بکەم:

یەکەمیان ئەوەی کە ماوەیەکە پرسیارێك یان چەند پرسیارێکی بێ وەڵامتان لە خۆتان هەیە، نازانم ئەو پرسیارانە چین؟ بەڵام دەتوانم بە ئێوە بڵێم وەڵامی پرسیارەکانتان لەناوجەرگەی نوسینەکانی ئەم کتێبەدا دەدۆزنەوە. کەوابوو ئێستە کە پرسیارتان هەیە و لەوەش گرنگتر بەشوێن وەڵامەکانیاندا دەگەڕێن، هەلی پێویست بدۆزنەوە و بەبێ وەستان بابەتەکانی ئەم کتێبە بەوردییەوە بخوێننەوە و هەرکاتێك شتێك هات بە بیرو زەینتاندا یاداشت و تۆماری بکەن...



لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٥٠٠٠) دینار